رۆمان

# ئەو خەنجەرەی شمشێری سەربڕی



نووسینی
ع . م / پیرس

٢٠١٢

رۆمان

# ئەو خەنجەرەی شمشێری سەربڕی

لە نووسینی

ع. م / پێرس

١٩٦٧ - ١٩٩٢

ناوی کتیب: ئەو خەنجەرەی شمشێری سەربڕی

نووسەر: ع. م / پێرس

بابەت: ڕۆمان

تیراژ: ٥٠٠ دانە

دیزایین و کاری هونەریی: ئارام شوانی

چاپ: چاپەمەنی ژێنەر

بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(١٢٩٦) ساڵی ٢٠٠٧ پێدراوە

به:

- گەلی کورد و گەلی عەرەب. .
- شۆڕشگێڕەکانی شۆڕشی کورد..
- ئەوانەی لە گۆماوی ئەنفالدا مەلەیان کرد و نەخنکان. .
- نەوەی پاشەڕۆژ.

پێشکەش ..

# پێشەکی

لە مێژبوو بەتەمای ڕۆمانێکی وەها بووم.

هەر چەندە ئەم پەرتووکە نۆبەرەی هەوڵەکانمە، بەڵام ئومێدەوارم چەند سووچێکی کێشە نەتەوەیییەکانی کۆمەڵگای کوردیم یەکالا کردبێتەوە و ئازارەکانی شار و لادێم کەم یا زۆر گوڵچین کردبێت و لەگەڵ هەست و نەستی خوێنەری ئازیزا یەکیان گرتبێتەوە.

گێڕانەوە لە ژێر هەر بەرگێك و لەسەر هەر پەڕە کاغەزێك درامای ژیانی مرۆڤ لە مێژوودا تۆمار دەکات و وێنە ڕابردووەکان لە دووتوێی خۆیدا ئەهێڵێتەوە.

گێڕانەوە لەم ڕۆمانەدا گێڕانەوەی ڕاستەوخۆی برینە تازەکان و کێشە و ڕووبەڕوو بوونەوەی گەلێکە بەرامبەر بە ستەمکاران. .

ع. م بیرس

## -١-

"توند خۆت بگرە با نەکەویتە خوارەوە، گوێچکەم مەگرە کورە، دەست خەرە سەر سەرم".

ئەمە قسەی کاکم بوو، لەسەر قەڵادۆشکانی ئەو بووم، حەشاماتێکی زۆر ڕیزیان گرتبوو لەسەر جادەی سلێمانی بەرامبەر بە گەڕەکی بەرتەکیە، ئەو گەڕەکە بەناوی تەکیەی شێخ جەمیل و شێخ عەلی گەورەی تاڵەبانەوە ئەو ناوەی بەسەردا بڕابوو، نەمدەزانی خەڵکەکە چاوەڕوانی چین و بۆچی وا لەوێدا ڕیزیان گرتووە، پاش تۆزێك چەند ئۆتۆمبیلێك تێپەڕبوون و حەشامات هەموو دایان لە چەپڵەو پڕ بەدەم هاواریاندەکرد عارف .. عارف .. عارف .. هەندێکیش هاواریان دەکرد: هەتا هەتا هەتایە .. کورد و عارەب برایە.

تومەس ئەمە ( عەبدوالڕەحمان عارف سەرۆك کۆماری عێراقە و تەشریف بۆ سلێمانی دەبات )!!

وردە وردە پێدەگەیشتم.. وردە وردە دەمبینی و دەمبیست، گوێم لە وشەکانی کوردستان و تێکۆشان و خەبات و ترس و نهێنی و ڕزگاری و مەلا مەستەفا دەبوو.

سەرەتای ڕۆژانی چوونە قوتابخانە بوو. سەرسامی دیمەنی تازە و جیهانێکی تازە دەبووم، پێدەکەنیم و دەشترسام. نزیکی بەهار بوو نەمدەزانی مێژووکەیە؟ چەند پیاوێکم بینی هەریەکەو پارچە

پەڕۆیەکی زەردیان لە قۆڵی چەپیان بەستبوو. جلەکانیان وەك جلی مامۆستاکانمان نەبوو، ئەوان شەرواڵ و شاڵ و فەرەنجی و کوڵەباڵیان لەبەردابوو! نەمدەزانی بۆچی هاتوونەتە قوتابخانەکەمان؟

لەوە بەدوا رۆژێکیان لە گۆڕەپانی قوتابخانەیا هەر پۆلە و بەجیا ڕیزکراین سرودێکی تازەیان پێگوتین سرودی:

**خوایە وەتەن ئاواکەی، چەن دڵگیر و شیرینە،**
**دەشتی خۆش و رەنگینە، خاکی گەوهەرەئاوی کەوسەرە**
**پڕ لە گوڵ و نەسرینە**

ئەم سرودە ئاوازێکی زۆر شیرین بوو لام، قوتابیەکان لە قوڵایی دڵ و پڕ بە گەروو هاواریان بۆ دەکرد، بەڵام من بە گوێرەی دڵ چێژم لەو سروودە شیرینە وەرنەدەگرت کە بۆ یەکەم جار بوو گوێم لێبێت؛ خەیاڵم هەر لای سەر پەنجەکانی پێمبوو، کە جار و بار دەچزان بە پێڵاوە لاستیکەکەی پێمەوە، ریزی پۆلەکەی ئێمەیان ڕووەو هەتاو ڕاگرتبوو، منیش جووتێ پێڵاوی لاستیکی ڕەشی بێگۆڕەویم لە پێدا بوو، بە تیشکی هەتاوەکە سوور دەبووەوە، دەبوو پەنجەکانی پێم گرژ بکەمەوە تا نەگەنە نوکی پێڵاوەکانم. بەڵام ئەوەی سەرنجی منی ڕادەکێشا نازە بوو، نازە ناوە ڕاستەقینەکەی (نازم) بوو هەردوو دەستی دەگرتە ئەملا و ئەولای دەمییەوە و هاواری بۆ دەکرد. دیاربوو سرودەکە خوێنی ئەویشی هێنابووە جۆش، ئەو قوتابییەکی رووت و رەجاڵ و چەتوون بوو، تەنها لە قوتابی نەبێ لە هەموو شتێك دەچوو، سەر دەستەکانی شەقار ببوو، کراسێکی بێ یەخەی لەبەردابوو، کەمیش پێدەکەنی و کەس نەیدەوێرا خۆی لە قەرەی بدا.

تەنانـــەت مامۆســـتا و بەڕێوەبـــەریش لـــە بـــەڵا و ڕەفتـــاری ئـــەو دەسـڵەمێنەوە، تـا ڕۆژێکیـان بـە پـێڵاوی قـوڕاوی یـەوە چـووە سـەر کورسییە دارەکان و بەسەریاندا بازبازێنێی دەکرد، بۆیـە مامۆستا لـەوە زیاتر خۆی پێ ڕانەگیرا و چەن دارێکی مستەحەقی تێ سرەواند.

– هەی سەگبابی بەرەڵا، توخمی شەیتان.

نازەی ناردەوە بۆ ماڵـەوە بڕیاریـدا تـاکو بـاوکی نـەهێنێت نەیەتـەوە بـۆ قوتابخانـە، ئـێ ئەمـە بـەس بـوو بـۆ ئـەو خـوا دای، هـەر ئەوەنـدە لـە قوتابخانـە چـووە دەرەوە شـریخە لـە پەنجـەرەی یەکەیەکـەی پۆلـەکان و پەنجـەرەی ژووری بەڕێوەبـەر هەڵـسان. شوشـەی پەنجـەرەکان هاڕەیـان دەهـات و ورد و خـاش دەبـوون، تـەواوی قوتابخانـەی ڕەجـم کـرد ناچـار چـەند قوتابییـەکیان نـاردە دەرەوە تـا بکەونـە شـوێنیا و بیگـرن، بـەڵام کەس نازەی بۆ نەگیرا.

پاش چەند ڕۆژێ نازانم کێشەی نێوان نازە و مامۆستا و قوتابخانە چـۆن کۆتـایی هـات. حەوشـەی قوتابخانـەی مەولـەوی لـە ئاسـت شەقامەکەوە دە دوانزە پێپلیکـان نزمتر بوو، نـازەم بینی بەسـەر پشتی کـەرێکی سپی بـێ کورتانـەوە ڕەشمەیـەکی بـە دەسرازە بـۆ کردبـوو بـە پێپلیکانـەکانا ئەهاتـە خـوارەوە و دەفتـەر و کتێبـی لـە گونیەیـەکی قوڵفـەدارا بـە دەسـتەوە بـوو، کەرەکـەی لـە باخـچەی قوتابخانەکـەیا بـە دارێکەوە بەستەوە و خۆیشی تێکەڵ بە قوتابیـەکان بـوو، زەنـگ لێـدرا و گۆرەپان چۆڵ بوو..

مـام حـەکیمی کـارگوزاری قوتابخانـە کابرایـەکی سمێڵ پێنجفلـسی بـوو، هـەموو ڕۆژێ سـەبەتەیەك تـرۆزی یـا خـەیاری زەردی کـەرخۆری ئـەهێنا و لەتـە خـەیارێکی بـە تـرش و خوێـوە ئەدایـە پێـنج فلـس،

کەرەکەی نازەش کە ڕەوشتی خاوەنەکەی گرتبوو، جگە لەوەی باخچەی قوتابخانەکەی پڕ کردبوو لە تەرس، دەسرازەی پساند و چووە سەر تەشتە خەیار وەك سێرەی بەهار لەوەڕا، کاتێ مام حەکیم بە ئاگاهات قرتەی لێ بڕیبوو.

هەر چۆنێك بوو هەوڵێکی زۆر درا تا توانیان نازە لە قوتابخانە دوور بخەنەوە، نەقوتابی بوو قوتابی بێت نە دەسبەرداریش دەبوو، وەك منداڵێك لە شیری دایك بیڕنەوە هەوڵێکی دوور و درێژ درا تا قوتابخانەیان لەبەرچاوی خست.

ئەو هەرزەکار ببوو، ڕۆژێکیان چوو بوە سەر گومەتی گەرماوی بلاخ کە بەیانیان تایبەت بوو بە ئافرەتان تا پاش نیوەڕۆ، لە کونی ناوەڕاستی گومەتی گەرماوەکەوە تەماشای ئافرەتە رووتەکانی کردبوو، بە ڕێکەوت ئافرەتێك سەری هەڵبڕیبوو، دەم و چاوێك و دوو ناولەپی لە دەلاقەکەوە بینیبوو وا دەنواڕێتە ناو گەرماوەکە، ئافرەتەکە کردبووی بە قیژە و هەراو و هەرچی لە گەرماوەکە دابوو ڕایان کردبووە گۆشە و کەنارەکان تا خۆیان لە دیدی نازە بشارنەوە، بەلام بێسوود بوو دەم و چاوی ئەو لە ناوەڕاستی بنمیچی گومەتەکەیا وەك مانگێکی دەستکرد هەموو پێچ و قوژبنێکی هۆڵی گەرماوەکەی لە ژێر کۆنترۆڵی خۆیدا گرتبوو، تایەکێك لە ئافرەتەکان دەچێ بە کلیل دارەکە دەڵێ و ئەو دەچێتە دەرەوە بە چەند پیاوێکی گەڕەك ئەڵێ و ئەوانیش لەگەڵ چەند پۆلیسێکا خۆیان دەگەێننە گومەتەکە. ئەم کارە زۆری پێ ئەچێ ئەو هەر بە دیدی نەزەر حەسار مەیدانێکی چاکی بە ئافرەتەکان کردبوو هەرچۆنێك بوو دوان لەپۆلیسەکان خۆیان گەیاندە پێیەکی و ڕایان کێشا، بەلام ئەو چوارمێخەی لەسەر دەلاقەکە کوترا بوو دەستی گرتبوو

بەو شیشە ئاسنەی کە بە نێوەندی دەلاقەکەوە توند کرابوو. بە ئامان و زامان لێ نەدەبووەوە، تا چەند تێلایەکیان سرەواندە ناو شانیا ئینجا بە ئاستەم دەستی شل بوو نازەیان هێنایە خوارەوە و بردیان.

من لە ریزی قوتابیانی قوتابخانەیا قوتابیەکی بچکۆلە بووم، دەترسام قوتابییە گەورەکان لە کاتی ڕاوڕاوێنا خۆیانم پیا بکێشن و بکەومە ژێر دەست و پێیانەوە ئاخر ئەوان زۆر گەورە بوون هەندێکیان سمێڵیان لێهاتبوو دەیانتوانی شەڕ لەگەڵ مامۆستاکاندا بکەن، هەمیشە بیرم لای ماڵەوە بوو بیری دایەم دەکرد.

خێزانی ئێمە وەك هەر خێزانێکی تر نەبوو نازانم دایە و باوە بەچ شێوەیەك بیریان لە دامەزراندن و پێکهێنانی ئەم خێزانە کردبووەوە، دە برا و دوو خوشك هەمووشمان قوتابی بووین، باوکە بە موچەیەکی کەم کارگوزاری قوتابخانەی زێوەر بوو، خۆ ئەگەر دەموچاو هەڵگرتن و بازەڵە ڕنین و مامانی کردنی دایە نەبوایە ئاردەواکەی ئێوارەش نەدەبوو. هەریەکە و نیو چەمچەی بۆ دەکرایە کاسەیەکی بچوکەوە و بە لەتێ نانەوە دەخورا. نازانم جل و بەرگ و پێلاو و پێنووس و پەرتووکی ئەم هەموو قوتابییە چۆن دابین دەبوو، سەرباری ئەوە جار جارە لە قوتابخانە پوولێکی خۆبەخشی فەلەستینی بە زۆر دەدرایە قوتابیان وێنەی سەربازێکی چەکداری لەسەر بوو لە سەرەوە نووسرابوو فیدائی فەلەستین لە ژێرەوە نووسرابوو دەفلوس، دە فلس دە فلس بوو هەر وا بە ئاسانی نەئەدرایە قوتابی، دایکم ئەیوت ڕۆڵە بڵێن ئێمە هەژار و دەسکورتین، بەڵکو لێتان خۆش بن، بەلام باسی دەسکورتی لە قوتابخانە سوودی نەبوو نە مامۆستاکان لێدە گەڕان، نە دەشکرا لەبەر چاوی قوتابییەکان خۆمان بەکەم و بێ هێز نیشان بدەین

بۆیە چاکتر وابوو هەر لە دایە بپارێینەوە تا دەفلسەکەمان بۆ چارەسەر بکات، مامۆستا ئەندەلیۆس پیاوێکی میهرەبانبوو، ئەوئەیوت:
ئەمـــە لەدەســـەلاتی ئێمـــەدا نییـــە، ئەمەپیتاکـــەو حکومـــەت بـــۆ فەلەستینیەکانی کۆدەکاتەوە کەلەگەڵ جولەکە بەشەڕهاتوون.
دادوبێـدادێکی زۆرمـان بـوو لـە بـارەی کـەم و کـورتی ڕۆژانـە و نـەبوونی جـل و بـەرگی پێویـستی قوتابخانـە، بـەلام هەمیـشە دایکـم دەیگـوت قـەیناکا ڕۆڵـە پـشووتان درێـژ بـێ، ئێـوە دەبـێ بـە دەرزی بیر هەڵکـەنن، تـا ماوەیـەکی زۆر هەرچیم دەکـرد ئـەو ڕسـتەیەی دایکـم بـۆ هەرس نەدەکرا، دەمزانی و نەمدەزانی مەبەستی چییە! ئاخر بە دەرزی بیر هەڵکەنن دەبێ چەندی پێ بچێت؟ خۆ تا مردن ناگاتە ئاو، ئەرکێکی زۆر قـورس بـوو، هەرچـەند بـیرم لـەوە دەکـردەوە وا دانیـشتووم و دەرزییەکم بە دەستەوەیە و بیر هەڵئەکەنم، چین چین ئارەقم دەڕشت و توشی دڵە کوتێ دەبووم.
ئێمە ناچار بووین پشوومان درێژ بێت، دایە نەبێت باوکە چوونە قوتابخانەی لا مەبەست نەبوو، لەگەڵ ئەوەشا کاتی کۆبوونەوەی نهێنی داوایان لە ئێمە ئەکرد نهێنیەکانیان بۆ بخوێنینەوە، هەر ئەوە بوو جار و بار دڵی باوکەی نەرم ئەکرد بۆ چوونە قوتابخانەمان، ئەوەی کە بە تـەواوی باوکە دەسـەلاتی بەسـەرا ئەشـکا، سـەعدولای بـرام بـوو کـە لـە خێزانە تـەلاق دراوەکـەی باوکم بوو. باوکە فـەرمانی خـۆی بەسـەر ئـەوا سەپاند و لە قوتابخانە دەری هێنا. دایـەش هیچ بەرگرییەکی لـەو کـارە نـەکرد، چـونکە تـەنها ئـەو کوڕەیـان هـی خـۆی نـەبوو، ڕۆژی ڕەش و دەرگـای ژان و نەگبـەتی و نەهامـەتی سـەعدولا لـەو ڕۆژەوە کەوتـە سەرپشت، بێ سێ و دوو پڕ بە سینیەك محەلەبییان بۆ ئامادە کرد و

دەبوو بەگوێرەی قاپە بچکۆڵەکانی سەر سینییەکە پێنج فلسی بهێنێتەوە، جۆرەکانی دەسفرۆشی نەما پێی نەکرێت تا سنووقێکی بۆیاخ کردنی پێڵاویان بۆ پەیدا کرد و شانیان پێ خستەبەر.

ئێمە بۆ خۆمان خێزانێکی دەست کورت و تامەزرۆ بووین بەڵام سەعدوڵا بە تایبەتی، برسی و نائومێد و بێ بەش بوو. هیچ ئێوارەیەك نەدەگەیشتە سەر سفرە، ئەولەبەردەم سینەما خەیام یان ئەتلەس پێڵاوی قەڵتاخی ئەفەنییەکانی بۆیاخ دەکرد، تا شەوێکیان درەنگ وەخت گەیشتەوە ماڵ وتی: دایە! چیمان هەیە.. کاکم لە هەموومان گەورەتر بوو هەڵیدایە..

-(تەنها توێکڵە خەیار هەیە دانیشە بەنانەوە بیخۆ!!)

هەندێ نان و توێکڵە خەیارەکانی کۆکردەوە و چووە سەر جێگای نوستنەکەی. بە هاندانی دایە تێکڕای خێزان دژایەتی و سوکایەتییان پێ دەکرد. سەعدوڵا ژیانێکی سەختی بردە سەر تا گەیشتە ڕۆژی سەربازی.

زۆر دەترسام لەو پڵنگەی بەسەر قۆڵی سەعدوڵای برامەوە بوو، جل و بەرگی سەربازی کۆماندۆ بوو ئارمی پڵنگ بەسەر قۆڵەکەیەوە بوو، هەقم بوو لەو پڵنگە بترسم، ئاخر پڵنگ نیشانەی هێرش و غەدر و مل شکاندنە، بە تایبەت ئەوپڵنگەی سەر قۆڵی سەعدوڵا کە هەمیشە چاوەکانی زەق و کەڵبەی تیژ و هەڕەشەی دەکرد. تەنها کاتێ کە مایەی خۆشگوزەرانی بوو، ئەوشەوانە بوو کە هەموومان پارەی بلیتێکمان کۆ دەکردەوە و دەماندایە کاکم تا بچێتە سینەما و شەوێ کە هاتەوە داستانی فلیمەکەمان بۆ بگێڕێتەوە. کاتی گێڕانەوەی فلیمەکە هەموو فەرمانێکی کاکم بە خێرایی ئەنجام ئەدرا. هەرکە لە ناوەڕاستی

قسەکاندا داوای ئاوی بکردایە، لە جیاتی یەکیَ دوانمان ڕامان ئەکرد بۆ ئاو هێنان، بە ڕۆژیش هەر بیرمان لای داستانی فلیمەکەی کاکم بوو، ناچار بۆخۆمان سینەمایەکی بێپارەمان دروستدەکرد، قالەی برام تەنەکەیەکی بەتاڵی ڕۆنی شاپەسەندی سەرهەڵپچڕاوی ئەهێنا و بە بزمار کونێکی بچوکی لە ناوەڕاستی تەنەکەکە دەکرد و کاغەزێکی سپی دەچەسپاندە ناو تەنەکەکەوە بەرامبەر بە کونە بچوکەکە لە سێبەرەکەیا دایئەنا ڕووە و هەتاوەکە بە نۆرە سەرمان ئەخستە سەری و دەبوایە منداڵان لەبەر هەتاوەکە ڕوو بە ڕووی تەنەکەکە زۆران بازی و رمبازیَ بکەن و یەکتری هەڵشێلن تا ببێتە فلیمێکی خۆش، وێنەکانی دەرەوە لەسەر کاغەزەکە دەبینرا. نۆرەی تەماشاکردنی سینەمای من بوو سەرم خستبووە سەر تەنەکەکە و گونیەیەکیان دابوو بەسەرما، هاوڕێکانم کە ئەکتەری بەشە فلیمەکەی من بوون بێزار بوون و ڕۆیشتن، شاشەی سینەماکەم کەسی تیا نەما جگە لە دەرگا دوو دەرییەکەی ماڵی حاجی سەمینی دراوسێمان و هەردوو پەنجەرەکەیان، چین چین ئارەقم دەڕشتە ناوتەنەکەکەوە، زۆر گەرم بوو، بەڵام حەزم نەدەکرد لە شاشەی سینەماکەم دوور کەومەوە. جار و بار مریشك و قاز و مراوی لەبەردەمما چینەیان دەکرد، لە پڕ کەسێك لە فلیمەکەدا قازێك بەبن باڵیەوە بوو وەك بەرزەکی بانان ڕای دەکرد پاش چەند چرکەیەك.. نەخێر پۆلیسێکیش بە تێلایەکەوە بەهەمان ڕێگادا رایدەکرد.

- کوڕە ڕاوەستە! نەڕۆی حەرام زادە! ڕاوەستە! ڕاوەستە!

زانیم ئەو دەنگە نایەتەوە ناو فلیمەکەی من، ناچار سەرم هەڵبڕی.

خۆ ئەوە دیسان نازەیە! کاکی پۆلیس راوی دەنێ، نازە خۆی کرد بە ماڵی ئەکە شێتا، ئەکە شێت کابرایەکی تورە و شەڕانی بوو لەگەڵ لووتی خۆیا شەڕی ئەکرد بۆیە پێیان دەگوت (ئەکە شێت) خۆی ناوی ئەکرەم بوو. ئەو کاری سەوزە فرۆشی ئەکرد خوا ڕەحمی بە نازە کرد ئەو کاتە لە ماڵەوە نەبوو ئەگەر نا خوێنی دەکردە کاسەوە، پۆلیسەکەش خۆی کرد بە ژوورا، منیش سینەمام جێهێشت و خۆم گەیاندە ماڵی ئەکەشێت، پۆلیسەکە تێلاکەی توند بەدەستەوە گرتبوو سەری دەکرد بە یەکە یەکەی ژوورەکانا، نازە بوو بە دڵۆپێ ئاوو چوو بووە ناو زەوییەوە، دیار نەبوو، پۆلیس تاوی دایە سەربان منیش بە دوایا، سەربانەکە کۆمەڵێ سنووقە سێو و قەفەسی خورماو گونیە شڕی زۆری لێ بوو لەناو گونیە شڕەکانا ملی قازێك وەك نێرکە ڕێواس بەرز ببووەوە کاکی پۆلیس گەیشتە سەری و نازەی دەرهێنا، بکوتە کوێت دێشێ.

قالەی برام جگە لە سەروکاری سینەما شارەزاییەکی چاکی هەبوو لە دروستکردنی سەیارەی تەل و کۆلارە و چەندین کەرەستەی یاری تر، لەگەڵ ئەمانەشا تابلێی چەتوون و کەتنکەر بوو هیچی وای لە نازە کەمتر نەبوو، ڕەنگ نەبوو دەسفرۆش یا دۆدرمە فرۆش یا پیرە مێردی هەژار و گەدا ڕووی بکردایەتە گەڕەکەکەمان ئیتر قالە دەبوو بە ئەسپێی کراسە کۆن و لە کۆڵیان نەئەبووەوە. خۆی دەکردە پێشەوای منالی گەرەك و دەبووە مایەی گاڵتەجاڕی و پەستکردنی گەدا و هەژار و دەستفرۆشەکان. بە تایبەتی کاتێ کە عەلەجوجە بهاتایە، عەلەجوجە ناوێکی یەکگرتوو بوو بۆ هەموو پیرە شێتۆکە و گەداکان، ئەم داماوە کابرایەکی سوورەی شێتۆکەی گێل بوو، تەمەنی دەچووە شەست ساڵ

و شەرواڵ و کورتەکێکی شڕی لەبەردابوو، سەروڕیشی پاك سپی بوو، بەپێی پەتی بە کۆڵانەکاندا دەگەڕا تا خێرەومەند خۆراکێکی پێ بدەن، زۆر لە منداڵ دەترسا چونکە تەشقەڵەیان پێ دەکرد، قالە پەیتا پەیتا سیخورمەی بەپاشۆڵیا دەژەنی، ئەویش دەکروزایەوە و دەیگوت:دەتوخوا بوزم [1] پێوەمەکەن دوایی حیزدەبم.

تێکڕا منداڵ دەیاندایە قاقای پێکەنین، ئینجا هەموو پێکەوە دەیانگوت (عەلعەلە جووجەی دەلاڵی چوارمشکی خوارد بەکاڵی) ئەویش ئەوەندەی تر تووڕە دەبوو، یا منالی گەڕەکی فێر دەکرد بە ئافرەتە قەرەجەکان بڵێن، قەرەج قەرەج مامزی هێلکە و ڕۆنەکەی دزی نایەگەڵی بۆ پایزی، ئەوانیش بە زمان و زاراوەی خۆیان پڕ جنێویان دەکردین.

---

[1] پەنجە، نەقیزە، پل.

## -٢-

ئەو پاش نیوەڕۆیەی سەرگەرمی تایە کۆکردنەوە بووین کە ئامادەیان بکەین بۆ شەوێ و ئاگری نەورۆزیان پێ بکەینەوە، گەرمەی بەرەی شەڕی شۆرشی ئەیلول بوو. تایەیەکم خل کردەوە بەرەو خوار تا بیگەیەنمە گردی کنیسەکە کە ڕووبەڕووی گۆڕستانی شێمحێدین بوو لەبەر تەکیە، بۆ نەهامەتی تایەکە لەبەردەم مالّی وەسفی دا جوجکێکی پلیشاندەوە. جوجکی مریشکەکانی وەسفی بوو، وەسفی ژنێکی دەمهار و زمان درێژی تورکمان بوو. لەگەلّ ئاگاردار بوونی بە مردار بوونەوەی یەکێ لە جوجکەکانی و زانیشی کە من بووم ئیتر دەمی کرایەوە چ کرانەوەیەك، ئامادە نەبوو جوجکێ بکا بە قوربانی جەژنی نەورۆز، نەورۆزی ئەو سالّەم لێ بوو بە دۆزەخ، ڕام کردە مالّەوە ئیتر نەموێرا دەرکەوم، دایکم پاش چینێك تێهەلّدان وتی:

-چۆن ئەم سەگە کوێرە لەم بار و دۆخە ناسکەیا دەمی وەسفیمان لێ ئەکاتەوە و ئەمانخاتە بەر ئاگری شەڕی تورکمان ،

ئەو شەوە من بووم بە هۆی هەلّدانەوەی لاپەرەی مێژووی شەڕی کورد و تورکمان

باوکم درێژەی پێدا. .

وتی:

. ئەم وەسفیە لە شەڕی کورد و تورکمانەکاندا دەمپاکانی بە دەستەوە گرتبوو بە هەموو هێزی ئەیکێشا بە ڕانی جەنازەی لە سێدارە دراوەکانی کوردا و جار و بار هەلهەلەیەکیشی بۆ ئەکێشا.

درێژەی پێداو:

ـ رۆڵە: ئێوە نازانن ئەمانە چ مشەخۆر و بەکرێگیراوێکن لە هیچ و خۆڕایی بە فەرمانی رژێم بوون بە سەگی پۆلیس و کەوتنە وێزەی ئێمە، خۆ ئەگەر کوردی گوندەکانی دەوروبەر بە هانای کەرکوکەوە نەهاتنایە ئێمە قڕ دەکراین چونکە ئەوان لە بەغداوە پشت گیری دەکران، ئێستاش ئێمە لە تەنگانەداین و دەستمان لە ژێر بەرددایە، مەعز بۆ خوا دەمی ئەم سەگانە مەکەنەوە! هەر ئەمانە بوون لە کاتی پێشوازی و گەڕانەوەی مەلامستەفا لە ڕوسیا کەتێپەر دەبوو بەناو شاردا لەسەر سەربانەکانیانەوە لە جیاتی گوڵباران، گەند و گویان هەڵئەدایە سەر ئۆتۆمبێلەکەی، ئەمانە زۆڵن زۆڵ، سفەتیان بۆ دایکی خۆیان نی یە! بایەکەی چۆن بێت ئاوا شەن ئەکەن!.

باوکم ئەیوت:

ئەمانەڕۆڵەی ئەم خاك و ئاو و ولاتە نین، ئەمانە بەڕەچەڵك تورکمانی ناوچەی ئازەربایجانی ڕۆژهەلات وتورکمان سەحرای ئێرانن، لەسەردەمی سەرەتای شەڕی عوسمانی و سەفەوی یەکانی ئێران لەجێگای خۆیان ئاوارە دەبن و زۆرێك لەپیاوەکانیان کوژراون بەدەست سەفەوییەکان، عوسمانییەکانیش ئەمانەیان هێناوەتە ئەم ولاتەی ئێمەو بەدرێژایی ڕێگای سولتانی لەتەلەعفەرەوە بۆکەلەك یاسین و هەولێر و پردێ و کەرکووك و تازە و دوز و کفری و خانە قین بلاوی

کردونەتـەوە بەمەبەسـتی خزمـەت کردنـی قافڵـەی لەشـکری عوسمـانی تاسەردەمی هێڵی شەمەندە فەرەکەیش.

ئـیتر خۆیـان لەدەسـت ئینگلیـز هـەڵ هـاتن و ئەمانـەیان بـەجێ هێشت.

نـازانم بۆچـی باوکـە وابـیری دەکـردەوە و پەسـت بـوو لەچـینی تورکمان،ئاخر من دوو هاوڕێم هەبوو منداڵی خێزانی تورکمان بوون،ئەم پەستییەی باوکەم لا سەیر بوو بەرامبەر تورکمان بەم رادەیە.

لەوە بەدوا نەورۆزی هەر ساڵێك پڕ مەترسی تـر ئـەبوو، ئێـوارەی بەرلە نەورۆز دەبوو بەفڕکە فڕك و ڕاوڕاوێنی پۆلیس و لاوانی کورد، تـا جارێکیـان پۆلیسەکان بـە هەڵـەداوان بـەرەو لای ئێمە هـاتن، ئێمـەش لـە دەوری تایـە ئاگراوییـەکانا کـۆ ببوینـەوە و سـرودی نـەورۆزمان دەگـوت لـەپڕ وتیـان هـات !!، هـەموو هەڵـساین و ڕامـان کـرد بـیٚ ئـەوەی هـیچ کامێکمان باشوور و باکوری خۆی بزانێت ئاگرمان جێهێشت، یـەکێك لـە پۆلیـسەکان گەیـشتە سـەر ئاگرەکـە، تـوڕەیی و قـین، هۆشـی لیٚ بڕیبـوو. بۆیە بە هەر دوو دەست پاڵینا بە تایە سووتاوەکەیا و تایەکـەش ڕاسـتە ئاگری پێوە دیـار نـەبوو، بـەڵام یـەك پارچـە ببـوو بـە ژیلـە مۆ و پشکۆ و سـپی هەڵگـەڕابوو، هـەردوو دەسـتی پۆلیـسەکە دیـواودەر چـووە نـاو تایەکـەوە و کـروزەی لیٚ هەڵسا، قیـژەی پـۆلیس گەیـشتە حـەوت تـەبەقی ئاسمان.

– تاکەی تۆ حەیا و شەرەفی من ئەبەی! بەهۆی ئەتواری تۆوە من توانای سەرهەڵبرینم نەماوە کاتێ بە بەردەم ئەم دوکان و بازارەیا ئەڕۆم.

شەقەی لێدانی قایشێك هەڵئەسا و دیسان ئەیوت:

کەی ئەبی بە ژن کەی؟!

ئۆرهان بە دەم گریانەوە ئەیووت:

ئێ منت پێ قبوول ناکرێ تەڵاقمدە.. تەڵاق، من ئەچمە قەبری خۆم و تۆش ئەچیتە قەبری خۆت، بۆ دەسم لێ هەڵناگری بۆ؟!

بۆ ئەوەی لەوە زیاتر نەبینە شایەتی قیامەت، سێبەرەکەمان بەجێ هێشت و ڕۆیشتین، سەیفە سینییە شەکرلەمەی خستەوە سەر سەری و هاواری دەکرد: وەرن بۆ ئەم شەکرلەمە جوانە!... منیش بە دەنگێکی لەو بەرز تر: ئەوەی نەیخوا پەشیمانە! ... تا گەیشتینە بناری قەڵا بەرامبەر بە پردی تەبەقچلی، تەبەقچلی فەرماندیەکی سەربازی ڕەکەز پەرست وخیزانەکەی تورکمان بوو، بویە لە شەڕی کورد و تورکمانەکەیا پشتگیری لە چینی تورکمان دەکرد، ئەو فەرماندەی تیپی دووی سەربازی بوو دەستی لە خوێنی سەدان کوردی ئەو شەڕەیا بوو، لەگەڵ دەستەیەك لە ئەفسەران لە کاتی فەرمانرەوایی قاسمدا گوللەباران کران، پاش کوژرانی بەعسیەکان پردەکەیان بە ناویەوە کرد!.

سەیفە دانیشت و پشتی نا بە دیوارەکەوە، سینییە شەکرلەمەکەی خستە سەر کۆشی، منیش بەرامبەری چیچکانم کرد و هەردوو ئانیشکم خستە سەر چۆکم و هەردوو مستم خستە ژێر

چەناگەم، لە پڕ کابرایەکی زلەی عارەب وەکو کێوێك بەسەرسەرمانەوە وەستا و وتی:

بێشل واحد.

سەیفە عارەبی چاك نەزانی وتی:

- واحد عەشرە ثنیَن خمسە و عشرین

کە دەبوو لە جیاتی خەمسە و عشرین بڵێ خەمستا عەش، ئەو ویستی بڵی دانەی دەفلس و جووتی پانزە فلس کەچی ووتی دانەی دەفلس و جووتی بیست و پێنج فلس ئاخر شەکرلەمەکە دەبڵ و حۆپە بوو.

کابرای عارەب داچەمیەوە وەك پەڕۆشـڕ لە زبڵدانا ڕاکێشێ و هەڵیتەکێنێ لنگی سەیفەی گرت و هەڵیتەکان و شەکرلەمە پەرش و بڵاو بووەوە بەناو خاك و خۆڵەکەیا.

– ئەخ لگەحبە عەبالەك ماکو حکومە!؟

سەیفە قسەکان پەڕییە قوڕگی و هاواری کرد

+ ئێ لێش لێش ئێ لێش؟

منیش دەرپەریم و لە دوورەوە بۆ سەیفە و زەرەری شەکرلەمەکەمان دەگریام، خۆزگە هەر بۆ چاو تروکانێك بەقەد ئەو عارەبە گەورە دەبووم ئینجا بزانە چۆن بە خەنجەرێ لەسەر بۆقی ملیەوە تا سەر قنگی وەکو ماسی شەقم ئەکرد، داخەکەم ئەو ئارەزووەم بوو بە گرێیەکی شێرپەنجە و لە دڵما مایەوە.

کە گەڕاینەوە ماڵەوە دەترساین بۆ زەرەری شەکرلەمەکە سزا بدرێین کەچی بەسەر کێشەیەکی قووڵتردا هاتینەوە، ناونووس هاتبوو، ناونووسێکی عارەب لەسەر کورسیە ئاسنیە ژەنگاوییەکەمان

دانیشتبوو، دوو کۆمەڵ فایلی پێ بوو. کۆمەڵێك سپی و کۆمەڵێکیان شین، لەگەڵ دایکم و کاکمدا کێشمەکێشی کورد و عەرەبیان بوو، دایکم ئەیوت :

+ ئاخر چۆن ئەبێ عەشیرەتی شێرەبەیانی عارەب بێت ؟!

کابراش ئەیوت:

– چەن و چۆنی ناوێ هەموو عەشیرەتەکان هەر ئەگەڕێنەوە سەر عەرەب

هەر چۆنێك بوو بە زۆرە ملێ فایلە سپییەکەیان پێ پڕکردەوە کە تایبەت بوو بە کورد،

نازانم ئەم فەرمانبەرە نارەسەنە بۆچی بە زۆر و زۆرداری ئەیویست بمانکا بە عارەب، ئێ باشە ئەگەر هەموو عەشرەت و هۆزەکان رەچەڵەکیان بگەڕێتەوە سەر عارەب ! ئیتر ئەم دوو رەنگە فایلەی بۆ لەگەڵ خۆیا هێنا بوو؟

( با هەر یەك رەنگ فایلی بهێنایە و هەموو خەڵکێکی ئەم وڵاتەی بە عارەب بنووسیایە)!!

کابرای ناونووس رۆیشت، دایکم وتی:

– بەخوا.. وەك رۆژی رووناك لێم روونە، رۆژێك ئەبێ.. هەرچی کوردی ئەم شارە هەیە ئەگەر نەشمان کوژن دەرمان ئەکەن و ئەم شارەمان پێ جێئەهێڵن، بەڵام ئەوەی خواش نەیکا نابێ!

جوامێری هاورێم هات بە شوێنماو پێکەوە چووینە پاڵ دیوارە بەرزەکەی کنیسەکە، ئێمە زۆربەی کاتی پشوومان لە بناری ئەو دیوارە نمدارە رزیوە بەسەر ئەبرد، بە گوێرەی مێژووەکانی سەربەردە هەڵکەندراوەکانی ناو کنیسەکە مێژووی دروست کردنی ئەو کنیسەیە

دەگەڕایەوە بۆ سەرەتای مەسیحیەت، گوایە حەزرەتی مەسیح بۆ خۆی کاری تێدا کردووە، ناوی کنیسەی حەمرا بوو، سەردەمێك دەیانگوت حکومەت نیازی وایە ئەم کنیسەیە بڕوخێنێت بە بیانووی بەرنامەی ڕێگاوبان و شارەوانی و مەبەستی تر! کەچی ڕۆژێکیان کۆمەڵە ئۆتۆمۆبێلێك و مەسیحییەکی زۆر لەگەڵ لاشەی مردوویەکیاندا هاتبوون بۆ کنیسەکە، کابرایەك پێدەچوو مەتران و پیاوی دینی بێت وتی:

- بۆ ئەو کێشەیە ئێمە لە ڕۆماوە شکاتمان کردووە لە حکومەتی عیراق و لەو بڕیارە پاشگەزمان کردووەتەوە، چونکە بڕیارێکی لەم جۆرە لە دەسەڵاتی حکومەتی عیراقدا نی یە، با ئەم کنیسەیە لە وڵاتی ئەمانیشدا بێت.

باسی ڕوخاندن و وێران کردن، قسەکانی باوکمی هێنایەوە یاد کە ئەیوت:

- خانووەکانی (جمهوری) کۆماری ئەو ڕۆژە رووخان کە تۆ لە دایك بوویت خانووەکان لەگەڵ رووخانی مەلیك فەیسەلی دووەم و هاتنە سەر حکومی عەبدولکەریم قاسم و هاتنەوەی مەلا مستەفا لە ڕووسیا دروست کران، هەندێکیان لە بەرتەکیە و هەندێ لە بەری بلاخ و هەندێکیان لە زێویە و شوێنی تر، خەڵکەکە بە گەڕانەوەی مەلا مستەفا لە سڕی دەرچوون و چاوێکیان هەڵێنا و کەوتنە دروست کردنی ئەو خانووانە بە تایبەت ئێمە ڕەنجێکی زۆرمان لەو خانووەیا کێشا، کەچی لەگەڵ ڕووخانی حوکمی قاسمدا بە دەست بە عسیەکان، سوپایەکیان پێك هێنا بە ناوی (حەرەس قەومی) پاسەوانی میللی، بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە شوفڵ و بلدۆزەریان خستە وێزەمان بێ ئەوەی پێشتر

ئاگاداری دانیشتوانی ئەو خانووانە بکەن. ملیان پێوە دەنا هەرچی بە پەلە دەستی منداڵەکانی نەگرتایە و دەرباز نەبوایە بێ شك ئەکەوتە ژێر دار و بەرد و دیوارەوە، تا کاکت هەوڵی دا دانەیەك لە نێرگەکانی خانووەکە دەربێنێ، ڕەگباری فیشەکیان پێوە نا خودا ژیانی تەواو نەکردبوو، دایکیشت ئەوەی کە بۆی دەرباز کرا تەنها مریشکەکە و جوجەڵە تازە هەڵاتووەکانی بوو خستیە کۆشی و تۆی لەباوەش گرت و دەستی منداڵەکانی تری گرت و دەرباز بوو.

لەو هەموو خانوو و گەڕەك و بانەی جمهوریدا تەنها خانووەکەی حەمە گوڵە مایەوە کە لە نێوان گەڕەکی بلاخ وکنیسەکەدا بوو بە گردەکەوە، حەمە گوڵە کابرایەکی دوژمندار بوو، کاتی خۆی دوو پیاوی کوشتبوو، ئەوکاتی وێران کردنی خانووەکان بە مەئموورەکانی وتبوو ژێر خانوەکەی من بیرە نەوتە، ئەگەر بلدۆزەر بچێتە سەری تیا نوقم ئەبێ، قسەکەی چووبووە عەقلیانەوە و هێشتبوویانەوە بۆ کاتێکی تر، ئیتر ڕۆژگار تێپەڕین و لە بیر کراو خانووەکەی نەڕوخا.

باوکم ئەیووت:

زەعیم صدیقیش هەریەکێ بووە لەم تورکمانانە و ئەفسەرێکی دەسەلاتداربووە لە سلێمانی، ئەویش لەوێ کوشتارێکی زۆری کردووە و خەڵکەکەی لە بازاڕدا داوەتە بەر دەستڕێژ و کۆمەڵێکی زۆری زیندە بەچاڵ کردووە.

هەر چۆنێك بێ حکومەت کنیسە ڕوخاندنەکەی بۆ نەچووە سەر، چونکە کنیسەی (حەمرا) خاوەنی هەبوو هەم کنیسە بوو، هەم گۆڕستان. بۆیە ئەمجارە بیریان لە شوێنە بێ خاوەنەکان دەکردەوە، سەرئەنجام لەگەڵ دانیشتوان و زیندووان هەر کارێك سەخت بوو. بۆ لە

ناو بردنی ئایین و نەتەوەکان بڕیاردرا ڕوو بکاتە وێران کردن ولەناو بردن و هەڵتەکاندن وسڕینەوەی گۆڕستانی کوردەکان، شۆفڵ و بلدۆزەری خستە نێو گەورەترین گۆڕستانی کورد لە نێوان گەرەکی شۆریجە و گەڕەکی ئیسکان بە بیانووی دروست کردنی شەقامێکی پان و درێژ و نەخۆشخانەیەکی گشتی. بە پێی جوگرافیای شارەوانی ئێستاشی لەگەڵیا بێت ئەو شوێنە چەپ و دوور دەست و دوور ئاوەدانی یە بە کەڵکی نەخۆشخانە نایەت. لە خوارووی کەرکوکەوە لایەکی گەرەکی شۆریجە و لە ڕۆژهەڵاتەوە هەزاران گۆڕی کوردی هەڵتەکان، ئیتر هەر کەللەسەر و دەست و قاچ و پەراسوو و ئێسك و پروسك هەبوو لە ژێر زنجیری بلدۆزەرا ورد و خاش دەبوون تا ڕۆژێکیان خۆشم نازانم بۆچی کەللەسەرێکی بچوکم وەك خۆشەویستێکی خۆم خستبووە ژێر باڵم و هێنامەوە کە دایکم چاوی پێم کەوت وتی:

-: وەی ڕۆڵە ڕۆ، هەتیو ئەمە چییە بە دەستەوە؟ خێرا بڕۆ بیبەرەوە جێگای خۆی! هەی بەچکە سەگ!

+: ئاخر ئەمە جێگای نەماوە بیبەمەوە بۆکوێ ؟

-: بیبە چاڵێکی بۆ هەڵکەنە و بینێژە.

کەللە سەرم برد و چاڵێکی وەك چاڵی ساوەرکوتانم بۆ هەڵکەند و بێ لەش ناشتمەوە.

لێقەومانی ئەو گۆڕستانە بە هۆی داکۆکی کردنی مەلا مستەفاوە بوو لەسەر کەرکوك، ئەو کاتێ لەگەڵ دارودەستەی حکومەت وتوو وێژی کردبوو لەسەر ئەوەی کە کەرکوك شارێکی کوردستانە و ئەوانیش دانیان پیا نەنا بوو، هەر سوور بوون لەسەر ئەوەی کە خاکی عارەبە، ئەمیش ناچار دەبێ کە پێیان بسەلمێنێ ووتبووی :

**+ مێژووی کورد و عەرەبایەتی ئەم شارە پێویست بە سەرژمێری زیندوان ناکات، دەکرێ (وەفدی) شاندی چەند وڵاتێك بانگهێشت بکەین و پێکەوە سەرژمێری گۆڕەکانی کورد و عارەب بکەین لەم شارە و بزانین چەندیان کورد و چەندیان عارەبن و ئێستاش کەس و کاری ئەم مردووانە لە کوێن و خەڵکی کوێن.**

**ئیتر حکومەت هیچ چارەیەکی نەما و دەستی دایە وێران کردنی گۆڕستان بۆگۆڕنی دیمۆگرافی ئەم شارە.**

## -٤ -

تـام و چـێژی ژیـانی ڕۆژانــی قوتابخانــه وەکـو جـاران نـەما بـوو، بەخـەتێکی گـەورە لەسـەر دیـواری قوتابخانەکـەمان نووسـرا بـوو: (امـة عربيـة واحـدة) (ذات رسـالة خالـدة) (گـەلی عـەرەبی یەکپارچـە، خـاوەن پەیامێکی نەمرە)!! لەو بەریشەوە بە خەتێکی درشت نووسرابوو (حـزب البعث العربي الاشتراكي) پارتی ژیانەوەی عەرەبی سوسیالیستی. نـاوی قوتابخانەکەشمان لە مەولەوییـەوە گۆڕا بـە ( ابـن خلـدون ). هـەر چەند لـەو نووسـراوانە ورد دەبوومـەوە و وەرم دەگێڕایـە سـەر زمـانی خـۆم، هەرچیم دەکرد و هـەوڵم ئـەدا بۆمن هیچی تیا نـەبوو، پەیوەندیشی بە منەوە نەبوو، کەوا بێت ئەم پارتە میللییە هەر بۆ ژیانەوە و پێ گەیاندن و یەکخستنی عارەبە، ئـەی کێ ئێمـە دەژێنێتـەوە؟ خۆ کەسێ نەیـەوێ گیانلەبەرێ بژێنێت بێ گومان نیازی کوشتنی هەیە.

بیرم لـە باخـچە چکۆلەکەی دایـە دەکـردەوە، کەلەسـەر جۆگەلـە ئاوەڕۆکـەی گـەرەکی ئیـسکانەوە بـەرەو لای ئێمـە شـۆڕ دەبـووەوە، سەرگەرمی دەبوو و هەندێ بامیە و بیبەر و باینجانی تیا دەڕواند، بۆ ئـەوەی شـەتڵەکان چـاکتر بـژین وردەگیـا و گورگـە گیاکـانی لـە ژێـر بنجەکانیان هەڵدەکێشا و دەیکوشتن.

کەواتە لە ڕوانگەی حکومەتەوە ئێمە بۆ عارەب وردە گیا وگورگـە گیاین، ئەیانەوێ هەڵمان کێشن و نـەمانهێڵن، جـا ئیتر چۆن لـە ژێـر ئـەو

دروشم و نووسینانەیا قوتابی بین، دەرفەت نیە خۆ ئەگەر بەو شێوەیەش قوتابی بوون قبوولْ نەکەین، ئەوا ئەوەندەی تر مالْ وێران و دەسخەڕۆ و دواکەوتوو سەرگەردان دەبین.

لە باخچەکەی دایەدا کات بەسەر بردن ژەمێکی دلْگیر بوو. دایە زۆر بە دلْ و داو سەرگەرمی باخچەکەی دەبوو، حەزی منیش تێکەلْ بە حەز و خواستەکانی دایە دەبوو، هەمیشە هاوکاریم دەکرد وگۆل و دێراو و جۆمالْم بۆ دەکرد، سەرەڕای ئەوەش لەگەلْ دایەدا سەتلْێ یا مەتارەیەکم هەلْدەگرت و لەگەلْ ژنان و کوڕ و کچ و کالْی گەڕەك دەچووم بۆ ئاو هێنان لە گەڕەکی ئیسکان یا بلاخ چونکە گەڕەکی ئێمە پتر لە پانزە سالْ بوو لوولەکانی تەڕاییان بەخۆیانەوە نەدیبوو!.

هەر چەند پیاو ماقولْ و سەرۆك خێزانی گەڕەکەکەمان چەند جار پێشنیار و نووسراویان بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاو وئاوەڕۆ ناردبوو، بەلاّم هیچ وەلاّمێکیان نەدابوونەوە، گەڕەکی ئێمە هەر بەبێ ئاوی مایەوە، لە کاتی ئاوبڕانی کۆلاّنی ئێمە تا ئەو کاتەی کە من ئاوم ئەکێشا دەیان گەڕەك بە ناوی (حی فلان و مدینە فلان ) دروست کراو کاروباری خزمەت گوزاریشیان بۆ جێ بەجێ کرا، لای ئێمە هەر ئاوی نەبوو، چەند جارێ نەبێ ئۆتۆمبیلێکی تەنکەر ئاوی بۆ هێناین ئەویش پیاوێکی دراوسێی خۆمان کرابوو بە شوفێری تەنکەر لە شارەوانی، لە دوای کاتژمێر دووی نیوەڕۆ فەرمانگە دادەخرا و ئەویش تەنکەرەکەی بە پڕی ئەهێنایەوە بۆ خۆیان و دراوسێکان، کاتێ فەرمانگە پییان زانی تەنکەرەکەیان لێ وەرگرتەوە و لەشوفێریش بە دەریان نا، چەند جارێ لە ڕێگای کەسانی تایبەتەوە سکالاّ و بێدادی بە نووسراو و ئیمزای هەموو گەڕەك گەیشتە بەردەستی پارێزگای کەرکوك کە دەگەیشتە ئەوەی

بـزانن گەڕەکەکـە کـوێ یـە، دەرئەکـەوت کـە گـەڕەکی کـورد نـشینە، نووسراوەکەیان بێ سەر و شوێن دەکرد، کەچی لە دوایيا دەرکەوت کە کاتی  خۆی میراوی گەرەکەکەمان لە نۆرەی گرتنەوە ئاوی گەرەکەکەیا بـە شیـشە دەم قـولاپی یـە درێژەکـەی قوفڵەکـەی گرتبـووەوە و ڕۆیشتبووەوە بۆ ماڵەوە لە بەختی دانیشتوانی گەرەکا شەوێ تەمەنی درێـژی بـۆ ئێمـە بەجێهێـشتبوو، ئیتر لـەو کاتـەیا شـۆفلْ و بلـدۆزەریش خەریکی چاك کردنی ڕێگا گشتی یەکان دەبن، شوێنی قوفڵەکە تەواو ئەکەوێتـە ژێـر جادە و میراوی تازەش دانامەزرێ لـە شـوێن ئـەو، ئاوی گەرەك ئەبێتە ئاشی ئاو لێ بڕاو، لـە پاش ئـەو هـەموو سـاڵە نـازانم بە چ هۆیەك دەور وبەری قوفڵەکەیان هەڵکەند، کە کردیانـەوە ژەنگاوی ئاوی پێش پانزە ساڵ لە لوولەکانەوە هاتە دەرەوە.

چـزە  لـەلاڕانم هەڵـسا، ئاوڕم دایـەوە مامۆسـتا بـە شـوڵێکەوە لـە پشتمەوە وەستا بوو.

–هەتیوە کـەڕ و گێـلْ، گوێـت لـە زەنـگ نـی یـە ؟.. نابینی قوتـابی یـەکان هەموو چوونەتە پۆڵەکانیان؟..

دەستم بەلاڕانمەوە گرت و بەرەو پۆل بۆی دەرچووم.

گلۆپی ئوتۆمبیلەکان لە نیوە بەرەو ژوور بەڕەنگی شین بۆیاخ کرا بوون، ئەوە فەرمانێکی کوت و پڕی حکومەت بوو، شەوانە خەڵکەکە لە ماڵەوە و لەسەر کۆڵان و چایخانەکان بە دیار ڕادیۆوە پۆل پۆل دادەنیشتن.

دەڵێن شەڕ لە نێوان حکومەتی عێراق و ئێران بەرپا بووە کەس نەیدەزانی هۆی چییە؟ ! بەڵام هەندێك دەیانگوت لەسەر ڕێکەوتن نامەی جەزائیری دژ بە شۆرشی مەلا مستەفایە.

جەماوەرەکە لەلایەك دڵتەنگی بەرەو پیرچوونی شەڕ و وێران کاری بوون، لەلایەك دڵشادی دروست بوونی دوژمنێکی سەرسەختی مەچەك ئەستووری لە کورد بەهێز تر بوون بۆ حکومەتی عێراق.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کڵپەی ئاگری شەڕی نێوان دوو دوژمنی سەر سەختی کورد، پەرەی دەسەند، ڕۆژ بە ڕۆژ گەڕانەوەی لاشەی کوژراوی هەردوولا، شەو لە دوای شەو فڕکە فڕکی فڕۆکەی هەردوولا و هێرشی ئاسمانی و کون کون کردنی ئاسمانی شارەکان بە فیشەکی گڕدار، سات بە سات ڕاگەیاندنی سەربازی و تاوانبارکردنی یەکتر بە دەستدرێژیکار و کافر، ساڵ بە ساڵ چاوەڕوانی کرانەوەی دەرگایەکی خێر لەسەر کورد، بەردەوام ڕەشبگیری و ڕەوانە کردنی لاوان بۆ بەرەی جەنگ، زۆربەی لاوانی کورد خۆیان لە خزمەتی سەربازی دەشاردەوە و

ئامادە نەبوون بۆیان بجەنگن، حەقیشیان بوو، چونکە ئەو کەنداوەی شەڕی لەسەر دەکرا و ئەم پێی دەگوت کەنداوی عەرەب و ئەو پێ ی دەگوت کەنداوی فارس، ڕۆژێ لە ڕۆژان لاوێکی کورد تاقە پیاڵەیەك ئاوی لێ نەخوارد بووەوە. ئیتر لەسەر چی و بۆچی و بۆ کێ بجەنگن؟

سەرلەبەیانی بوو، چووم بۆ کڕینی هەندێ دەرمانی ژانە سەر بۆ دایە، لەو سەرەوە کە گەڕامەوە، خەڵکێکی زۆر لە وێستگەی پاسەکان کۆببونەوە. پاسێکی یانزەکەسی بچووك هات و حەشامات هێرشیان بۆ برد، شوفێر پاسەکەی لەو سەرەوە ڕاگرت، لەبەردەم ئافرەتێکی سفورا تا ئەو، بەر لە هەمووان سەرکەوێ و نەکەوێتە بەرتەکان و پاڵپاڵێنێ خەڵکەکە، کەچی هێرشی خەڵکەکە هەر گەیشتە سەری و کابرایەکی بەسالاچووی کەوا و چاکەت لەبەر کەوتە پشت ئافرەتەکەوە، پاڵپاڵێنی خەڵکەکەش لە دواوە، ئافرەتەکە پێ یەکی لە پاسەکەیا و پێ یەکی لە خوارەوە بوو ڕووی کردە دواوە و بە هەموو هێزی جانتاکەی کێشا بە دەم و لچی کابرای بە سالاچوودا. .

– ئەوە دەست بۆ ناو گەڵم ئەبەی هەی بێ شەرەف؟! دانا ڕزێی سەگە پیر؟.

کابرا چین چین کەوتە ئارەق ڕشتن و ڕەنگی زەرد و سوور و مۆر هەڵگەڕا. .

– کوا دایکم..؟ کوا من تشت وەها کردومە ؟..ئیشتە قەڕەباڵغە.. خەڵکەکە پاڵ ئەنێن لە من!!.

وردە وردە پاس پڕ بوو

–کورە هەی گەواد، تۆ بە نقورچ لا ڕانمت شین کردەوە، خەڵکی چی و پاڵی چی؟ ڕووی کردە خەڵکەکە و

– نازانم بۆ پیاو تا پیرتر بێت ئەوەندەی تر ئەتوار شڕ و ڕەوشت حیز ئەبێ ؟

ڕووی کردەوە کابراو..

–یا ڕەبی داڕزێی لەو حاڵەت باشترە ناپیاو!..

پاس بەڕێ کەوت و بۆڵەبۆڵێ ئافرەتەکەش بەردەوام دەبیسترا، گەیشتینە نزیك پردی شەهیدان، نازانم بە تەواوی بۆچی ئەو پردە پێ ی دەگوترا شەهیدان، ڕەنگە هەر بە هۆی کوژراوەکانی تورکمانەکانەوە بێت کە لەگەڵ کوردا، بەشەڕ هاتن ئەو ناوەی بەسەرا بڕابێ، کە لە ژێر فەرماندەیی ( ئەحمەد صالح عەبدییەوە ) پەلاماری کوردیان دەدا. ئەحمەد صالح عەبدیش فەرماندەیەکی سەربازی تورکمان بوو دەستێکی باڵای لە فەرمانەکانی شەڕەکەدا هەبوو، ئەگەرنا، خۆ عارەب هیچ خەبات و پۆلە شەهیدێکی لە کەرکووکدا نەبووە تا پردی بۆ ناوبنێ شەهیدان.

سەر پردەکە بە هێزی گاردی کۆماری گیرا بوو، جل و بەرگی بەڵەك و کڵاوی سووریان لەسەر بوو، هەر لە دوورەوە دەستیان بۆ شۆفێرەکە هەڵتەکان ڕووبکاتە ڕۆژئاوای شار، کەس نەیدەزانی بۆچی ئەو سەر پردەیان گرتووە و نایەڵن کەس بەسەریا تێپەر بێت، نەخێر کار تەنها لەسەر پردەکە نەبوو هەموو گۆشە و شەقامەکانی کە لا ئەدەن گیرابوو، لە هەر سەر سێ ڕاو چوار ڕایەك گاردی کۆماری و ئینزبات وەستا بوون. هەموویان پەنجەکانیان جووت دەکرد و دەستیان بەرەو باشووری ڕۆژئاوا تەکان ئەدا، تا دەهات ژمارەی پاسەکانی ڕووەو و باشوور لە زۆربووندا بوو، هەردەبوو بەرەوخوار بڕۆین خەڵکەکە لە پاسەکەیا شپرزە و مقۆمقۆیان بوو، ئافرەتە سفورەکە ئاگای لە ئازار و

شین بوونەوەی لاڕانی بڕابوو دەم و چاوی گرژ و چاوی زەق کردبووەوە و لە شووشەکەوە دەیڕوانی یە دەرەوە تا گەیشتینە بەر دەرگای یاریگای گشتی لەسەر ڕێگای بەغدا، پاسەکان وەك و دیلی جەنگ لە دەرگا گەورەکەوە خرانە گۆرەپانی یاریگاکە و خەڵکەکەیان دادەبەزاند و لە دەرگایەکی ترەوە دەچوونە دەرەوە، بە گوێرەی ژمارەی ئەو خەڵکەی لەوێ کۆکرابوونەوە، گومانم لەوەدا هەبوو کە شاری کەرکوك کەسی تری تیا مابێت و نەهێنرا بێتە ئێرە، لە پاڵە پەستۆی خەڵکەکەیا دوو دانە لەو دەرزیانەی بۆ دایەم کڕیبوو لە گیرفانی شەرواڵەکەمدا ورد و خاش بوون، کات گەیشتە پاش نیوەڕۆ. ئۆتۆمۆبیلێکی پشت قەفەسی سەوزی تاریك ڕەنگ هات و پڕ دوو ئۆتۆمۆبیل گاردی کۆماری و ئینزیباتیان لەگەڵدا بوو.

شانزە لاوی کوردیان لە ئۆتۆمۆبیلە قەفەسەکە داگرت، سەباح و بورهانیان تیا بوو. سەباح و بورهان دوو برا بوون لە گەڕەکی خۆمان، بورهان دوو مانگ بوو ژنی هێنا بوو، ئەم دوو برایەیان لە دەرەوەی شار دەستگیرکردبوو. شانزە لاوەکە لەوانە بوون کە ئامادە نەبوون بچنە بەرەی جەنگی عێراق و ئێران، سەرهەنگ قوسەی فەرماندەی ئینزباتی کەرکوك بڵند گۆیەکی بە دەستەوە گرتبوو. .

(* ئەی جەماوەری بە شەرەف !!

* ئەمانە کۆمەڵێ خائین و وڵات فرۆشن !!

* ئەمانە نایانەوێ بەرگری لە شەرەف و ئابڕوو خاکی ئێوە بکەن !!

*** بۆیە ئێستا لەبەر چاوی ئێوە بەسزایان دەگەیەنین، تا ببنە پەند بۆ هەموو خۆ فرۆشێکی تر..)**

**یەك لە دوای یەك بەرێ خران بۆ ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە، لە کاتی هەنگاو هاویشتنا یەکێك لە لاوەکان ئەژنۆی شل بوو، نیازی کەوتنی هەبوو لاوەکەی پشتیەوە بە شەوکەت و بالا بەرز بوو، هەردوو باڵی گرت و نەیهێشت بکەوێت، چونکە کەوتنی ئەویشی بە شەرمەزاری خۆی دەزانی بۆیە لێی نەگەڕا بکەوێت و چۆك لەبەردەم مەرگدا بدات. لە ناوەڕاستی گۆڕەپان ڕیزکران و شانزە سەرباز بەرامبەریان وەستان، دوو سەرباز کەوتنە بەستنەوەی چاویان بە پەڕۆی ڕەش و دەستیان لە پشتەوە، لاوە چوارشانەکە نەیهێشت چاوی ببەستن، بەڵام دەستیان بەست، لەگەڵ وشەی ( ارمیدا ) قرمەی دەستڕێژ ڕووی تێکردن، ئەوەی کە بە پێوە مایەوە لاوە چوار شانەکە بوو، ڕەگبارێکی تریان پێوە نا، کەوتە سەرچۆك سەرهەنگ (قوسەی) لێی چووە پێشەوە بە دەمانچەکەی یەك فیشەکی نا بە پشتی سەریەوە ئینجا لاوەکە بە لا داهات، پاشان زۆریان لە خەڵکەکە کرد بە هەموو هێزیان چەپڵە لێ بدەن و ئافرەتانیش هەلهەلە بکێشن. پارەی فیشەکەکانیشیان لە خاوەنی گوللە باران کراوەکان وەرگرتەوە.**

**ئەم کاری کوشت و بڕەش لە هەموو شارەکانی کوردستان ئەنجام درا، پاش هەموو هەوڵێك، لاوانی کوردی بۆ چارەسەر نەکرا.**

**ناچار بوو چەندین لەشکر و هێزی لە هەموو هۆز و تیرەکان و بە ڕاوێژکاری سەرۆك هۆزەکانی کورد پێك بهێنێ، بۆ ئەوەی نەبێتە مایەی ڕەخنەی عارەبەکان و نیشانی ریزەکانی سەربازیشی بدا، کە ئەوەتا کوردیشی سەرگەرم کردووە بە بەرگری لە وڵات و لەلایەکی تریشەوە**

لاوانی کورد ناچار نەبن بە هەڵاتن بەرەو دەرەوەی وڵات یا پەیوەندی نەکەن بە شۆڕشگێڕانی کورد و ڕوو نەکەنە ڕێگای بزاڤی ڕزگاری خوازی گەلەکەیان و هێشتنەوەیان لە ژێر ڕکێفی خۆیدا تا ڕۆژی خۆی دێت.

شەوێکیان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن سەرۆکی عێراقی هەڕەشەی لە پاشەڕۆژی چەکدارە کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی دەکرد، ئەو ئەیوت:

– تۆ بڵێی ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم جەنگە کۆتایی نەیەت، هەر ئەوەندەی تا جەنگ تەواو ئەبێ خوا بمهێڵێ بۆ ئێوە دەمێنم!

هەمان کات بە تەلەفۆن لەگەڵ فەرماندەیەکی سەربازی لەبەرەکانی شەڕی ناوچەکانی کوردستان قسەی دەکرد، ئەفسەرەکە دەیگوت:

– قوربان فرۆکەکانمان چەکدارەکانی خۆمان و تێکدەرەکان لێک جیا ناکەنەوە چونکە هەردولا جلی کوردی یان لەبەر دایە فرۆکەکان نازانن چۆن بۆمباکان بهاوێژن، ئەمیش دەیگوت:

–هەردولا هیچ جیاوازییەکیان نییە، سەگی ڕەش و سپی هەر سەگە، چۆنی ئەهاوێژن بیهاوێژن.

ئیتر هیچ ئۆقرەیەکم نەماو دۆم بە دانیشتن ماڵ وێرانە.

## -٦-

کۆتـایی بـەهارە و گیـا دەشـتی هـەردوو هەڵـەت و پانتـایی گەرمیان وەکو ڕەنگی ئێمە زەرد هەڵگەڕاوە، لەگەڵ باوە دیـن و ئـەنوەری هاوڕێما بڕیارماندا سبەینیٚ شار بەجیٚ بێڵین. تا گۆپاڵە بە ئۆتۆمۆبێل و لـەوێوە بـە پیـادەرەو بـەرەو گونـدی کلاشـکەران لـە بازیـانی بـاکووری جادەی سلێمانی، لـە هـەردو هەڵـەت و نـشێو و نێوەنـدی چیاکاندا پتر بۆنی ئـازادیم دەکـرد و هـەنگاوەکانم تونـدتر و گـورج تـر و بـە هێـز تـر دەبوون.

گونـد بـە گونـد ڕێـچکە بـە ڕێـچکە بـەرەو ناوچـەی قەلاسـێوکە کـە ئـامۆزا و کـەس و کـاری باوکـە لـەویٚ بـوون بـەریٚ کـەوتین، باوکـە لـە تەمـەنی هەشـت سـاڵیا پـاش ئـەوەی بـیٚ سەرپەرشـت ئەمێنێتـەوە ڕوو ئەکاتە شـاری کـەرکوك و لەسـەرەتاکانی سـەدەی بیسـتەوە لـەویٚ ژیـانی دائەمەزرێنێت. مـن یەکـەم جـار بـوو گوندەکـەی بـاوکم ببینـم، شـەویٚ لـە ماڵی کاکەسوور ماینەوە، ئەو زیاتر بەهاتوچۆی سنوورەوە خـەریك بـوو لە بەختی ئێمە وتی:

- ماوەیەکە هات و چۆ ناکەم چونکە ولاخەکـەم فرۆشـتووە تـا ولاخێکـی تر ئەکڕمەوە، بەلام ناونیشانی تەواوی ڕێگا و بانـەکانتان پـیٚ ئـەدەم کـە بتوانن بـۆ خۆتـان بڕۆن، ئێمـە منـداڵی شـار بـووین و هـاتوچۆ لـە ناوچـە

قەدەغە کراوەکانا بەلامانەوە سەخت بوو، دەترساین بەردەستی هێزەکانی حکومەت بکەوین و بە دەردی سەباح و بورهان بچین. ڕۆژی دوایی بەڕێ کەوتین یەکەم گوندی ئەوبەری جادەی دوکان، جاسەنە بوو کە لە نێوان چیای سارا و جاسەنە بوو. لامان دایە ماڵێك، ئەوان پێنج کچی قەیرەیان هەبوو، نیوەڕۆ هەموو هاتنە سەر سفرە، من و ئەنوەر و باوەدین نان و شەرم و دڵە کوتێمان پێکەوە خوارد، بەدامێنی سارا و جاسەنەیا بەرەو سەرگەڵو کەوتینەڕێ.

نازانم ئەم کابرا فیلیپینیە بۆ ورکی لە خواردنی گۆشتی سەگ گرتبوو؟ دەیووت:

– بە مێژووی زاینی ئەمشەوی داهاتوو جەژنی ئێمەیە، هەر چۆنێك بێت ئەبێ هەوڵم بۆ بدەن بۆ سەربڕینی سەگێك.

ئەم کابرایەیان وەکو بارمتە گرتبوو تا ببێتە کاغەزی فشار بە دەستیانەوە بۆ جێبەجێ بوونی هەندێ داواکاری لە حکومەت، ئەو لەگەڵ کۆمپیانیایەکی فیلیپینیا هاتبووە عیراق.

سەرگەڵو مۆڵگایەکی سەرەکی شۆڕشگێڕەکان بوو.

شۆڕشگێڕێك ویژدانی خستەکار و دڵی بە کابرای فیلیپینی سووتا، سەتڵێکی چینکۆ و تەشتێکی بۆ هێنا، ئینجا پێکەوە چوون بۆ ڕاوە سەگ.

تووتەڵە سەگێکی خڕینی بازۆڵە ئەستووریان هێنا، پێکەوە سەریان بڕی و کەوڵ کرا ئیتر کابرا داوای کرد کە تەنها بۆ خۆی سەروکاری بکا و لێی بنێ خوێ و بەهارات و پیاز و ترشیان بۆ هێنا، زۆر بە وردی و وەستاکارانە توتەڵەی ئاڵ و بۆڵ کرد و لە تەشتەکەیا هێنایە مەیدان.

شۆڕشــگێڕه هاوکارەکــەی داوای لێکــرد بەشــدار بێــت لــه خواردنەکەیدا، فلیپینی به دوو دڵییەوه ڕازی بوو، له ڕاستی یا نیازی وابــوو بــه تــەنیا خــۆی ئــەو ســەگە قوتــدا، بــەڵام چــاو بــەرەو ژێــری شۆڕشگێڕەکه بوو چونکه ئەو کەرەستە و پێویستی بۆ پەیدا کردبوو. توتەڵـه ســەگ خــورا و کاســە و کەوچـك و ســەتڵ و تەشـت لـه دەرەوەی ئاوایی فرێ درا.

ئێمە دەمانویست ڕۆژێ زووتـر ئاو دیـوی سنوور ببین و بگەینـه جێگای مەبەست، کەچی شۆڕشگێڕەکان دەیانگوت :-

- ئێمە ڕێگا نادەین هەرکەسـه و بـه کـەیفی خـۆی شـار بەجێ بێڵێ و ئـاودیوی سـنوور بێـت، ئێـوەی لاوان دەبـێ لـه وڵاتەکـەیا بمێننــەوە، شۆڕشگێڕبن یا تفەنگێ بکرن و وەك پشتگیرێك له شۆڕش له ناوچەکەدا بن.

پــاش چــوارده ڕۆژ کاغــەزێکی دەستنووســی بەقــەد پلیتێـك درایـه دەستمان:

- هـا ئـەو کاغـەزە بـەرن و بـڕۆن، ئـەم کاغـەزە تـەنها بـۆ بازگـەکانی خۆمانـه تـا سـنوور لـه دوایـن بازگـه بیدەنـەوە دەسـت شۆڕشـگێڕەکان چونکه ئەمە بۆ وڵاتی ئێران نابێت.

کاغەزەکەمان وەرگرت و ئامادەی ڕۆیشتن بووین، باوەدین له ڕۆیشتن بۆ ئێران پەشیمان ببوەوه وتی:

- وا هەست دەکەم من توانای ژیانی نامۆیی و دوور له کەس و کارم نەبێت.

دەستی کرده باخەڵیاو:

– ها ئەوە سەد دینار و من ئەم بیستەم بەسە چونکە ئەگەڕێمەوە گوندی قازان و لەوێ ئەمێنمەوە.

چاوە بچکۆلەکانی پڕببون لە فرمێسك، جیا بوونەوەی باوەدین لە ئێمە جیابوونەوە بوو لە پارچەیەکی خۆی، جیابوونەوە لە هاوشار و هاوزمان و هاوڕاز و ژیانی خۆی، قسەکان لە قورگیا پەنگیان خواردبووەوە هیچی بۆ نەئەوترا، دەستی کردە ملمان و خوا حافیزی کرد، تا بە پانتاییە لێژەکەیا سەرکەوت چەن جارێ ئاوڕی دایەوە، لەسەر لوتکە دەستی بەرز کردەوە و دوا خواحافیزی کرد و لەچاو ون بوو. من و ئەنوەریش سەرەو خوار گوندمان بەجێهێشت.

## -٧-

سەرچەم سنووری عێراق و ئێرانە، ئەمبەر دۆڵی دۆڵبێشك و ئەو بەرگوندی ئاشكان، سیمێكی ئەستوور لەمبەر بۆ ئەوبەر توندكرا بوو، قەفەسێكی ئاسنی پێوە شۆڕكرا بووەوە، من و ئەنوەر لەگەڵ چەند كەسێكی تر چووینە ناو قەفەسەكەوە و بەگوریسێكی درێژ لەو بەرەوە قەفەســـەكەیان ڕاكێـــشا كـــە بەســـەر دوو خولخلۆكـــەوە دەڕۆیـــشت قەفەسەكەیان پیا هەڵواسیبو لە چەم پەڕینەوە و خۆمان بەسەربازە ئێرانیەكان ناساند.

شەوی یەكەم لە گوندی ئیسلام ئاباد سەربازێك وەكو چاوساغ لەگەڵمان هات و ڕوومان كردە كەلاوە كۆنێكی چۆڵ.

بێـــستون و مـــژدە دوولاوی خـــەڵكی ســـلێمانی بـــوون لەگـــەڵ خێزانێكی تردا لە ژوورێكدا دانیشتبوون، باوكێكی عەینەك لە چاوو تۆزێ ڕیش هاتوو ئافرەتێكی خانمانە و نەشمیل لەگەڵ دوو كچی قژ زەرد و جوانكیلە پاش درەنگانێك من و ئەنوەر بە جیا و بێستوون و مژدە و باوكی منداڵەكان بە جیا لەبەر چرا نەوتییەكە نۆبەتداریمان لە سیسرك و قالۆنچە و دووپشك گرت نەك ئازارێك بەو دوو كۆرپەیە بگەینن تا بەیانی چوار دووپشكمان كوشت.

سبەینێ بۆ سەردەشت كە شارۆچكەیەكی سنوورییە لە كوردستانی ئێران، ڕۆژی دوایی پاسێكی درێژ هات و هەموو سەركەوتین لەگەڵ

کۆمەڵێکی تر کە وەك ئێمە پەنابەر بوون. بۆیەکەم جار بوو سەفەری وا دوور و درێـژ بکـەم، بـێ ئـەوەی کـەس بزانـێ بـۆ کوێمـان ئەبـەن، پـاش دوانزە کاتـژمێر رێگا گەیشتینە شارێك، کیلۆمـەترێك بـەر لـە گەیشتن لەسـەر تابلۆیـەك نووسـرابوو (خـوی) خـوی شـارێکی سـەر بـە ناوچـەی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا بوو، کەچی پاسە ماندووەکە هـەر نەوەستا تاریك ببوو گەیشتینە بەر دەرگا بچکۆلەکەی حەوشـە تەلبەندەکە، خێزان بە جیـا و سـەڵتە زەلام بـە جیـا، کـە ڕۆژ بـووەوە دوورایـی دەور و بـەری خۆمـان بینـی، بەهـەر چـوار لا دەشـتی بـوو، دوو چیای نـوك تیـژ لـە دوورەوە دەیانڕوانی یە دەشتێیەکە،پاسەوانەکان ئەیانوت:

ئەو دوو کێوە سنووری ئێران و ڕووسیان، لە خەیاڵی خۆمدا دەمگوت: رەنگە مەلا مستەفا و شۆڕشگێڕەکانی کاتی خۆی بە پشتی ئەو کێوانەدا تێپەڕ بووبێتن و لـە ئـاوی ئـاراس پەڕیێتنـەوە و چـوو بێتن بۆ ڕووسیا دەبـێ چـەندە مانـدوو بـووبن تـا بـە پیادەڕەوگەیـشتوونەتە ئـەوێ. لـە ماوەی دە ڕۆژدا پەنابەرێکی زۆر گەیشتنە لامان کۆمەڵێ پاسی درێژیان هێنا و کەوتینە ڕێ، دیسان بەرەو چارە نووسێکی نادیار. پاش شەو و ڕۆژێـك پاسـەکان لەبـەردەم وەزارەتـی کیـشوەر لـە تـاران ڕاگیرا، پـاش چـەند کاتـژمێرێك پاسـەکان دووبـەش کـران، خێزانـەکان بـۆ ئۆردگـای جەهروم لە خوارووی ئێران و سەڵت بۆ ئۆردوگای (ذباحان)ی کەرەج لە شارۆچکەیەکی نزیك تاران.

ئۆردوگـای ذباحـان دوو باڵەخانـەی چـەند نهـۆمی و حەوشـێکی خـۆش و گۆرەپـانێکی یـاری باڵـە و ژێـر زەوی یـەکی یانـەی وەرزشـی یاریـەکانی ئاسن و لـەش جوانی و کۆنفۆ و تێنـسی تیـابوو بـە خـەیاڵی خۆمان تا ڕادەیەکی زۆر لە دەنگ و باسـی شـەڕە وێرانکاریەکـەی عێـراق

و ئێران دوور کەوتووینەتەوە و بە ئاسانی هەواڵەکان نابیستین، کەچی لەوێش چەند بڵندگۆیەکی گەورەیان بە دیوارەکانا هەڵواسیبوو ڕۆژ تا ئێوارە دەنگی جۆق و مارشی سەربازی و سرودی مرۆڤ هەژێن بە زۆر و زۆرداری دەتەپێنرایە گوێمان.

پاشان یەکەیەکە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکراو دوای ئەوە مافی مۆڵەتی دەرەوەی پێ ئەدرا، هەفتەی بیست و چوار کاتژمێر بۆ تاران و مانگی دەڕۆژ بۆ شارەکانی تر هێشتا نۆرەی مۆڵەتم نەهاتبوو، لە هۆڵی نهۆمی خوارەوە لەگەڵ هاوڕییاندا سەرگەرمی باسی ڕابردوو و ئایندە بووین لە پڕ بوو بە زرم و هوڕ و هەرایەکی زۆر لە نهۆمی دووەم، لاوێك کە لە نهۆمی دوو بوو بە پەلەهات و :-

-ئەوە ئاگاتان لێ نییە؟

-چی یە؟چی بووە؟

-شەڕە ! لە نێوان هەردوو هۆڵی بەرامبەر بە یەکتری نهۆمی دوو

- ئێ باشە شەڕ لەسەرچی؟

لەسەر کاك هیوا، هۆڵی ئێمە هەموو کوردین، هۆڵی بەرامبەر هەموو عارەب و ئەندامانی ڕێکخراوی شیعەی عیراقیین، ئەوان بە شەش کەس هێرشیان کردووەتە سەر کاك هیوا، لە ژێر لێدانا بێ هۆشیان کردووە و ئیتر هەردوو هۆڵەکە تیك ڕژاونەتە یەکتر.

هێرش بێ ئەوەی چیتر چاوەڕوانی گوێ گرتن بێت، بەسەر ئێمەیا قەڵەمبازی کرد و بۆی دەرچوو، ئەو باڵا بەرزێکی دەست و مەچەك ئەستووری گەنم ڕەنگ بوو، بە تەواوی نەمدەزانی ئەم هێرشە خەڵکی چ شارێکی خۆمانە بەڵام ئەیانووت :

- ئەمە مامۆستای تایکواندۆیە و پلەی پشتێنی ڕەشی هەیە.

هەمووومان پێکەوە گەیشتینە سەرەوە، لە هۆڵە گەورەکەی نێوان هەردوو هۆڵی کورد و عەرەبدا شەڕی واترلۆ خولقابوو، بکوژ و ببڕ سەگ ساحێبی خۆی نەئەناسی، هێرش کە بە پێی پەتی و تراکسوت و فانیلەیەکەوە گەیشتبووە سەرەوە پێشتر تۆزێ وەستا تا کورد و عەرەبەکانی بۆ جیا بێتەوە، بەلام لەو مەحشەرەیا هیچی بۆ جیا نەبووەوە ، ناچار بە بازێك وەکو بزمار لە ناوەڕاستی هۆڵەکە و حەشاماتی شەڕگیربوو، ئینجا هاواری کرد

-هەرچی کوردە با دوورکەوێتەوە

هەرچی دەیناسی خێرا دوورکەوتەوە، لەگەڵ بەرز بوونەوەیا تەنها بە پاژنە و لاپێ یەکانی لە خولی یەکەمدا شەشی خست، یەکێ لەوانە کورد بوو هێرشی نەناسیبوو، تا دوور کەوێتەوە، هەر چۆنێك لێ ی نزیك دەبوونەوە دوان سیانێکی دەخست، پەیتا پەیتا هاواری دەکرد:-

-هەرچی کوردە دوور کەوێتەوە با بەر نەکەون!!

سەرەنجام پاسە وانەکان هاتن و هۆڵ کڕ و کپ بووە وە هێرش پشتی نا بە دیوارەکەوە بیست و پێنج عارەب و کوردێك لە زەویدا بێهۆش کەوتبوون، پاسەوانەکان میلی تفەنگیان ڕاکێشابوو ڕووە و هێرش ڕاینگرتبوو، ئەویش هەردوو دەستی ڕاست و چەپ ڕاگرتبوو ڕەگەکانی قوڵ و مەچەك و شان و ملی وەك ڕەگی دار هەڵزەپیبوون دەیوت :-

-هەرچی بێتە پێشەوە ملی ئەشکێنم،

تا بەرپرسی (اطلاعات) هەواڵگری هات و بە قسەی خۆش و نەرم هێوری کردەوە، ئەویش قسەکانی کابرای بەرپرسی ئۆردوگای گرتەگوێ، دیاربوو ئاشنایەتییەکیان پێکەوە هەبوو، چونکە هێرش

ماوەیەکی زۆربوو لە ئۆردوگای (ذباحان)ی کەرەج بوو، لاوێکی ڕەوشت بەرز و جێگای ڕەزامەندی بەرپرسانی ئۆردوگاکە بوو، هێرشیان دایە پێش و ڕەوانەی تاران کرا، بێهۆشەکان کۆکرانەوە و ڕەوانەی نەخۆشخانەکران، ئەنجامی شەڕ شەش لە لێدراوەکان نەهاتبوونە هۆش و مردبوون.

قوڕاوەکە تەواو سەخت بوو، بۆیە درایە دادگا و کەس بە تەمای رزگار بوونی نەبوو، پاش سێ دانیشتنی دادگا و ئامادەکردنی چاکترین پارێزەری تاران لەلایەن چەند هاورێ یەکی پارەداریەوە، هێرش ئازادکرا، چونکە بەپێی دەستوور هیچ یاری زانێکی تایکواندۆ بۆی نی یە ئەم یاریە لەشەڕدا بەکاربێنێ تا ژمارەی شەڕکەرانی بەرامبەری لە دەکەس تێپەر نەکا، بەڵام شەڕکەران لە دژی ئەو بیست و پێنجیان هەر لە زەوی کەوتبوون، ئەوان تێکرا هەشتا کەس بوون.

هێرش لە سەرەتای شەڕەکەیا ژیرانە بیری کردبووەوە کە دەیگوت:

هەرچی کوردە دوور کەوێتەوە با خۆم بەتەنیا بم، ئەمە خۆی دەیزانی گەر بە تەنیا بێت لە بەرژەوەندی ئەو دایە.

بەڵام پاش ئازادکردنی نەیانهێشت بگەڕێتەوە ئۆردوگا، چونکە لەگەڵ عارەبەکاندا تووشی دوژمن داری ببوو.

یەکسەر لە تارانەوە ڕەوانەی ئەورووپا کرا.

چوونە ئەورووپا بۆ هەموو ئەو لاوانە ئازادبوو کە گەیشتبوونە ئۆردوگای کەرەج ئاسانکاریشیان بۆ دەکرا لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە، بەڵام هەندێك لەو لاوانە بۆ چوونە ئەورووپا نەگەیشتبوونە ئەوێ.

منیش یەکێك بووم لەوانەی بۆچوونە هەندەران نەگەیشتبوومە ئێران.

من بۆ گەیشتن بە ڕیزی شۆڕش و پەیوەندی کردن بە گورزی تۆڵە گەیشتبوومە ئەوێ، تۆڵە لە داگیرکەران و ستمکاران و ئابڕووبەران، بۆتۆڵەی لنگ ڕاکێشانەکەی سەیفەی برام، تۆڵەی ئاژاوە گێران و هاندەرانی شەڕی کورد و تورکمان، تۆڵەی ڕووخاندنی خانووەکانی جمهوری، تۆڵەی کردارەکانی زەعیم صدیق، تۆڵەی گەند و گوو هەڵدانی تورکمانەکان بەسەر ئۆتۆمۆبیلەکەی مەلا مستەفادا، تۆڵە سەندن لەوانەی ئاگری نەورۆزیان دەکوژاندەوە، تۆڵەی بورهان و سەباح کە بەناحەق گوللە باران کران، تۆڵەی هەزاران و هەزارانی تر، بەسەدان لاپەرەی سپیم ئامادەکردبوو لە دڵمدا کە ژمارەکانی تۆڵەی تیا تۆمار بکەم، چونکە وەکو ناولەپی خۆم ئەو ڕژێمەم دەناسی، حکومەتێك بە ئاشکرا ئەمانە لەبەر چاوی گەل بکات دەبێ بە نهێنی چی تری کردبێ؟ کاتێ بەقەلا دۆشکانی کاکمەوە بووم، ئەگەر دەمزانی ئەو خەڵکە چەپڵە بۆکێ لێ ئەدەن و کاکیشم دەستی لەمن بەرداوە و وەکو ئەوان کەوتۆتە چەپڵە لێدان، دەبوایە قژم لەسەری ببڕیایە و هەمووم دەسکەنە بکردایە، ئێستا بیری لێ ئەکەمەوە خۆ ئەگەر لەو سەر قەلا دۆشکانەوە پشتا و پشت بەرەوە بوومایە مێشکم ئەپرژا..!

کات بەسەر بردن لە ئۆردوگا ژیانی زیندانیەکی مۆدیرن بوو، چەند ڕۆژێ بوو ئەنوەر بەر لافاوی گواستنەوە کەوتبوو بۆ ئۆردوگای خورەم ئاباد، زیاتر هەستم بە تەنیایی ئەکرد.

کاتی خۆی پورم ئەیوت:

- نەجمی کوڕم لە ئەسفەهانە، نەجم بەهۆی نسکۆی شۆڕشی ئەیلولەوە گەیشتبووە ئەسفەهان و هەر لەوێ ژنی هێنا

بوو، بۆ ئەوەی تۆزێ لەو جیهانی زیندانی یە دوور کەومەوە، داوای مۆڵەتی دە ڕۆژم کرد بۆ ئەسەفەهان.

– چوومە لای ئاغای چاوشی، چاوشی کوڕێکی چوارشانەی مو زەردی چاوشینی عەینەك لە چاوبوو، ڕیش و سمێڵێکی تەنکی ئەهێشتەوە، تابڵێی لەسەر خۆو هێمن، تورکی ناوچەی تەورێز بوو.

تەقەیەکم لە دەرگاکەیدا.

لەگەڵ سەرهەڵبڕینا، پەنجەی دۆشاو مژەی خستە ناوەڕاست عەینەکەکەی و بەرزی کردەوە.

+وەرە..

–بەیانیت باش!

+بڵێ بزانم ئەتەوێ بچیتە کوێ؟

–ئەسفەهان.

+ئەسفەهان !.. بۆچی؟

–ماڵی پورزایەکم لەوێ یە، هەرچەند ئەدرەسی نازانم بەلام ئەچم بەڵکو بیدۆزمەوە. بزە پێکەنینێکی بۆ کرد و مۆڵەتەکەی بۆم ئیمزا کرد، بەو بزە پێکەنینە پێی گوتم ئەمە کارێکی گەوجانەیە دەیکەیت و ڕوو دەکەیتە شارێکی شەش ملیۆن کەسی و ئەتەوێ نامۆیەکی چەند ساڵە بدۆزێتەوە؟

گوێم نەدایە ئامۆژگاری یە خنکاوەکەی چاوشی و مۆڵەتم وەرگرت و بەنیگەرانیەوە ئۆردوگام بەجێهێشت. زیاتر نیگەرانی کەم خەرجی و فارسی نەزانین و بێ ئەدرەسی و سەفەرێکی خۆڕایی.

سواری پاسەکانی هێڵی (حسین ئاباد) بووم بەرەو خوار بۆمەیدان ئۆفیسێکی گەیاندن و گواستنەوەم دۆزییەوە بەناوی (شرکت

مسافر بری میهن تور) کۆمپانیای گەشتیاری ولات گوزار. پلیتی کات ژمێر پێنجی ئێوارەم بڕی هێشتا کاتژمێرێك مابوو بۆ بەڕێ کەوتنی پاسەکە چومە (سوپەر مارکێتێك) و وەك کەڕ و لاڵێك پسکیتێکم هەڵگرت و بیبسیەکم دایە دەست کابرای خاوەن دوکانەوە بۆی هەڵبچڕیم و لەسەر سنووقە بیبسیەکی بەتاڵ دانیشتنم و خەریکی خواردن و خواردنەوەیان بووم، ئافرەتێك دەستی منداڵێکی گرتبوو خۆیٚ کرد بە دوکانەکەیا پسکیتێکی بۆ بکڕیٚ، بیٚ ئەوەی تەماشای شت و مەکی ناو دوکانەکە بکا تەماشای دەستی منی کرد و پرسی:

– ئاغا ئەوەی دەستت چی پیٚ ئەڵێن؟ سەرم هەڵبڕی و جوینی پسکیتەکەم ڕاگرت، تێگەیشتم دەڵێت چی بەلام، وەلام کارێکی سەخت بوو، نەمتوانی بە فارسی بڵێم ئەمە چی یە!

نەگبەتی و بۆ نەهاتن ورك لە پیاو بگریٚ لە هەر شوێنێك بێت لە کۆڵی نابێتەوە لە دڵی خۆمدا دەمگوت :-

ئەم پلیتە چی بوو بۆم دەرچوو، باشە لە تەواوی ئەم شارەیا کەسی دەس نەکەوت پرسیاری لیٚ بکا من نەبم!؟

بەسەر و سیمایا دیاربوو ئافرەتێکی لادیٚ یە و بە ئیش و کار هاتۆتە شارەوە.

تەماشای پسکێتەکەی دەستی خۆمم کرد لەسەر کاغەزەکەی نووسراوبوو (تیتاب) سەرم هەڵبڕی و وتم :

-تیتاب

ڕووی کردە خاوەن دوکانەکەو:

– ئاغا تیتابێکمان بدەریٚ

به دوو قوم بیبسیەکەم هەڵدا و بۆی دەرچووم، تا کەسێکی ترنەهاتووە پرسیارم لێ بکا.
کاتژمێر پێنج و هەندێك پاس بەڕێکەوت، کاتژمێر دووی نیوەشەو لە خەودا بووم بە دەنگی گاڵەگاڵی شوفێر تاکسییەکان بەخەبەر هاتم، مسافرەکان خەریکی دابەزێن بوون، گڵۆپەکانی ناو پاسەکە داگیرسابوون ماندوویەتی پاش خەوی ناو ئۆتۆمۆبیل لەشی داهێزراند بووم، جانتا بچکۆلەکەم خستەسەر شانم و بەڕی کەوتم، هێشتا پێ یەکم لەناو پاسەکەیا بوو، یەکێك لە شوفێر تاکسی یەکان، قایشی جانتاکەی سەرشانمی ڕاکێشاو:
- ئاغا کوجا؟
دەستیم گرت و بە توندی لە قایشەکەم ڕاپسکاند.
-دەلاچۆ مردووت مرێ!..(کوجا)!..کوجای چی؟ من جوزانم بۆ کوێ مل ئەشکێنم؟!
شەوێکی کڕ بوو چۆن لە دەرگای پاسەکە هاتبوومە خوارەوە؟
ڕاستەوڕاست ملم نا بە شەقامێکی دوور و درێژدا، تابلۆی دوکان و بازارەکانم دەخوێندەوە، هەندێ لە تابلۆکان بە گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ نەخشێنرابوو ئەکوژانەوە و دائەگیرسان، لەسەر دەرگایەکی دوو دەری گەورە بە خەتێکی سوور نووسرابوو (مهمانخانه آرام) میوانخانەی ئارام لادەرگایەکیان کرابووەوە دەستم گرت بە قەراغ دەرگاکەوە و ملم بردە ژوورەوە پتر لە بیست پێیلکان سەرەو ژووربوو سەرکەوتم و گەیشتمە هۆڵی ئوتێلەکە، کەسی لێ نەبوو، ڕووم کردە ڕاڕەوێکی باریك دوو ڕیز ژوور بەرامبەر بەیەك بوو، بە ئاسپایی وەك دزێکی وریا یەك یەك دەسکی دەرگاکانم بادا دەرگایەکیان کرایەوە، ژوورەکە دوو قەرەوێڵەی

تیابوو، چۆڵ و گلۆپەکەیش داگیرسا بوو، چوومە ژوورەوە و دەرگام لەسەر خۆم داخست، جانتا بچکۆڵەکەم دانا و پێڵاوەکانم لە پێم داماڵی، زۆرماندوو بووم ژێر پێ یەکانم وەك تەپڵی سەرم لێی ئەدا، لەسەر پشت ڕاکشام و هەردوو دەستم لە پشتی ملما کلیل کرد، نازانم چەندی پێچوو لەگەڵ ڕاوەشاندنی نووکی پێم بەخەبەر هاتم:

– ئەهای ئاغا بولەند شۆ! چاوم کردەوە، ئافرەتێکی بە تەمەنی بازۆڵە ئەستوور، ناوقەدی بەپەتێك شەتەك دابوو، مەمکەکانی وەك هەویر شۆڕببونەوە، لەچکێکی لە نێوچەوانەوە بردبووە پشتی سەری و هێنابوویەوە ژێر قورگی و گرێی دابوو، دیار بوو کە کارگوزاری ئۆتێلەکەیە و تێ گەیشتم کە دەڵێ ئەوا کاتژمێر هەشتە کەی هاتوویت و پارەت داوەیان نا؟بەلام من وەك کەڕ و کاسێك لە جێگای خۆم دانیشتبووم، تەنها وتم:

–من فارسی نەمیدانم

هەر چەند ئەمزانی ئەم ڕستەیەی من نەفارسییە و نەکوردییە و نە هەورامی، هێشتا هەر دەسبەردار نەبووم، وتم:

–چەند پول بدەم بە شوما؟

پێکەنینێکی بۆ کرد و وتی:

(پەنجاه تومان میشێ) هەرچی پارەم پێ بوو دەرم هێنا و لەسەر دەستم دانا، دەستی درێژکرد و ئەسکەناسێکی سەوزی خاکی هەڵگرت و وتی:

ـ ئینغەد

پارەکانم هەڵگرت و ڕووم کردەوە شەقام، ئیتر نازانم ئەو دەسەلاتی وەرگرتنی پارەی هەبوو یان نا؟ نازانم پارەکەی بۆ خۆی هەڵگرت یان خاوەن ئوتێل. سەر بەرەو خوار بەرەو قولایی شار پێشتر

هەوڵمدا ڕستەیەکی فارسی بخەمەسەر یەك و ئامادەیی بکەم، ئینجا لە کەسێ بپرسم: شوێنی کوردەکانی عیراقی لە کوێیە؟

پاش پرسیار کردن لە چەند دوکان و ڕێبوار هەموویان یا تۆزێ لچیان بۆخوار ئەکردەوە یا چەند ملیمێك سەریان بۆ سەرەوە دەجوڵان، دواجار پرسیارم لە کابرایەکی بە ساڵاچووی ریش هاتووی چاویلکە لە چاوی شەپقە لەسەر کرد، گۆچانێکی دارساجی جوانی بەدەستەوە بوو لەبەر دووکانێکا لەسەر کورسیەکی دار دانیشتبوو.

- ئاغا...!؟

تۆزێ سەری داخست و لەسەرووی عەینەکەوە تەماشای کردم.

-کوردی عیراقی کوجا؟..

کە دەبوو بڵێم:

کردهای عیراقی کجا هستند؟...

بە فارسی گوتی:

- ئێ! غەریبی؟؟

تۆزێ سەرم بۆ لەقان

- کوردی عیراقیت؟

تۆزێتر سەرم بۆ لەقان

ئەتەوێ ئەو گەڕەکە بدۆزیتەوە؟

تۆزێ تر سەرم بۆ لەقان

گۆچانەکەی بەرەو خوار درێژکرد.

ئەم جادە ڕاستە بگرە و بەری مەدە!

- بەڵی

برۆ تا ئەگەیتە سەر چوار شەقامە یەکتر بڕەکە!

- بەڵێ.

هەر بەم دەستەیا دەستی ڕاست ڕاوەستە!

بەڵێ.

ئەو تەکسیانەی ڕەت دەبن!

بەڵێ

پێیان بڵێ(توخچی) مەبەستی لە توخمچی بوو واتە هێلکە فرۆشان.

بەڵێ:

کە سواربووی دامەبەزە تا دواین وێستگە..

- بەڵێ: سوپاس حاجی ئاغا. . بەو شێوەیە ڕۆیشتم کە پێیگوتم، تەکسی لە کۆتایی وێستگە دایگرتم، بە هیچ شێوەیەك نەمدەزانی لە جوگرافیادا کەوتومەتە کوێوە ! لەسەرخۆ بەکۆڵانەکاندا دەڕۆیشتم بۆ خۆیشم دەمزانی ئەمەی دەیکەم کارێکی گەوجانەیە و چاوەڕوانی هیچ هیوایەك نەبووم تەنها شتێك کە نیگەرانی کردبووم، ترسی ڕووبەڕووبوونەوەی نە شارەزایەکی وەکو خۆم هەبوو پرسیارم لێ بکات دەڕۆیشتم و دەڕۆیشتم، بەڕاست، بە چەپ بۆپێش، بۆ پاش نزیکی نیورۆ بوو دوو منداڵم لەبەر دەرگایەك بینی یاری یان دەکرد و بە کوردی قسەیان دەکرد، بێ پرس و بێ ئەوەی لە دەرگا بدەم چوومە ژوورەوە، پیاوێك لە باخەکەیا خەریکی پاچەکۆڵەی ژێر درختەکان بوو. ماڵەکە خەڵکی گەڕەکی شوریجەی خۆمان بوون لە کەرکوك پرسیارم لێ کرد سەبارەت بە نەجمی پورزام ئەو وتی:

- ئەم ناوە ناناسم هەرچەند من زۆربەی کوردەکانی خۆمان دەناسم لێرە بەلام ئەم ناوەی تۆ دەیڵێیت باوەڕ ناکەم لە شاری ئەسفەهاندا بێت.

پەرداخێك ئاویان پێ دام و هەر لە حەوشەكەیا پشوویەكم دا و جگەرە خۆرێك دانیشتم

پاشان بیرم لەوە دەكردەوە كە چاكتر وایە ماڵی ئەنجومەنی كوردەكانی ئەسفەهان بدۆزمەوە وتم:

+ ئەی ماڵی ئەنجومەنی ئێوە لەم شارە لە كوێیە؟

– ئەنجومەنی ئێمە؟ بۆ ئەویش خزمی تۆیە؟

+ نا ئەو خزمم نییە، تەنها بۆ پرسیار ئەچمە لای

– ئا ...ئێ ئێ باشە

بانگی منداڵێكی كرد.

- ڕۆڵە بڕۆن لەگەڵ ئەم پیاوەیا ماڵی كاك تەحسینی ئەنجومەنی پێ نیشان بدەن دەی ڕۆڵە هەژارە خێرتان ئەگا،

كەوتی هەژارە دڵم بۆ حاڵی خۆم پڕ بوو. دوای منداڵەكە كەوتم بە چەند كۆڵانێكی پێچاوپێچا، لە دەرگایەكی دوو دەری ڕەشی دا دەرگا كرایەوە كاك تەحسینی ئەنجومەن، بالا بەرزێكی سەرو ریش ماش و برنجی چاویلكە لە چاو بوو، تەزبیحێكی زەردی دەنك گەورەی بەدەستەوە بوو ووتی:

– فەرموو

منیش هەمان ڕستەی ماڵە كەركوكی یەكەم پێ گوت:

تاوێك ڕاما و سەری بۆ ئاسمان بەرزكردەوە و دانە دانە دەنكی تەزبیحەكەی لە دەستی چەپەوە دەدایە پەنجەكانی دەستە ڕاستی لەبەر خۆیەوە:

نجم احمد: نجم احمد..

– ئەو چی تۆیە؟

+ پورزامه

– من ئەو کوڕە دەناسم:

فێنکاییەك بە دڵما هات

– نزیکەی پانزە ساڵ بەر لە ئێستا پێکەوە بووین پێشتر لەم گەڕەکە بوو، بەڵام هەر لەو کاتەوە لێرە نەماوە

دیسانەوە ورەم داتەپی

– من بەر لە سێ ساڵ لە ناوچەیەك بینیم، تۆزێ بناگوێ ی بۆ خوراند و:

– ئەزانی لە کوێ، لە شەقامی چوار ڕێ یانی حەکیم نیزامی، ئەو گەڕەکە پێ ی ئە...

قسەکانم پێی بڕی و وتم:

+هەر چۆنێکم پێ بڵێی بێ سوودە، چونکە من لەبیرم ئەچێتەوە چاکتر وایە بە تەواوی ئەدرەسەکەم لەسەر کاغەزێك بۆ بنووسی.

ئەدرەسەکەم وەرگرت و چوومە شوێنی مەبەست، بەڵام هەر ئەو ئەدرەسە بەس نەبوو، چونکە ناوچەیەکی زۆر قەرەباڵغ و فراوان بوو. ریزێ کابینەی تەلەفۆنی گشتی و ڕیزێ دووکانی سەوزە فرۆش و سوپر مارکێت و ساردەمەنی فرۆش وەکو ئەدرەسەکە بوو تاکاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ دوکان نەما سەری پیانەکەم و لێی نەپرسم کەس ئەو ناوەی نەناسی، تەواو شەکەت بووم، دۆدرمەیەکم کڕی و لەسەر شۆستەکە دانیشتم جانتاکەم خستە کۆشم، خەڵکی ئەو بەردوکان و بازاڕە ئاپۆڕەیان لێکردم و دەوریان دام، هەریەکە و بە جۆرێ سەبارەت بە من قسەیان ئەکرد.

منیش جاروبار زمانێکم لە دۆدرمەکەی دەستم ئەدا و ئەمڕوانیە ئەوان، دەمزانی چی ئەڵێن بەڵام نەمدەزانی قسەیان لەگەڵ بکەم قسەکردنی ئەوان لە فارسی نەدەچوو.

لە پڕ ماتۆڕسوارێك ڕاوەستا و دڕی بە خەڵکەکە دا و ملی درێژ کرد و تەماشای کردم، تا بزانێ ئەو خەڵکە لە چی کۆبوونەوتەوە و چ باسە؟ لایەکی لە قەرەباڵغیەکە هێنایە پێشەوە

- ئەرێ ئەوە چییە؟

یەکێ لە دووکان دارەکان هەڵێدایە..

+ ئەمە عیراقییە لە ماڵی کابرایەکی کوردی عیراقی ئەگەرێ.. ئەڵێ ناوی نەجمە، نەجم ئەحمەد گوایە لێرە ژنی هێناوە و خێزانەکەی خەڵکی ئێرەیە!

کابرای ماتۆر سوار دەستێکی خستە سەر شانم و وتی:

- وەرە!

نازانم ئەم فریشتەیە لە کوێوە خوا ناردی، لەپشتی ماتۆڕەکەوە سواری کردم و کەوتە ڕێ، بە چەند کۆڵانێکی پێچاوپێچی تەنگە بەرا ڕۆیشتین، لە دڵی خۆمدا دەمگوت:

بەخوا یا ئەوەندەی تر ونم ئەکا یا ئەمە فریشتەیەکە و خوا بۆی ناردووم.

هەر بە ڕێگاوە تۆزێ ڕووی بۆ دواوە وەرگێرا و

- نەجم چی تۆیە؟

+ پورزامە

- نەجم لێرە بەو ناوە ناناسرێت، ئەو لێرە ناوی (سەعیدە)، سەعید عراقی

+ بەڵێ، بەڵێ

گەیشتینە بەردەرگایەکی داری دوو دەری، دەرگاکە کرابووەوە و ئەودیوی دەرگاکە کۆڵانێکی تەنگەبەربوو، لەو سەرەوە دوو دەرگای لەیەك شێوە و لە تەنیشت یەك بوون.

کابرا دایبە زاندم و گوتی:

– ئەو دوو دەرگایە یەکێکیان ماڵی ئەوە، بەڵام نازانم کامیان، چونکە کاتێ لە کۆمپانیای قوماش چنین پێکەوە کارمان دەکرد، جار و بار ئەمگەیاندەوە ماڵەوە، لێرە دائەبەزی، بۆیە ئەزانم ئەو دوو دەرگایە یەکێکیان ماڵی ئەوانە تۆزێ بەنزینی بۆ شێلاو و شیرەی لە ماتۆڕەکە هەڵسان و ووتی:

خوات لەگەڵ

لە کۆتایی کۆڵان پێچی کردەوە و لەچاو ون بوو.

ئیتر مامەوە هەر خۆم و کۆڵانێکی چۆڵ، خوایە ئەم کابرایە چۆن سەربەخۆ منی هێنایە ئێرە! بەم ئێوارەیە ڕووبکەمە کوێ؟ خۆ ئەگەر ئەو دوو دەرگایەش ماڵەکەی ئەوان دەرنەچێ چی؟

چارەیەك نەبوو جگە لەوەی بچمە، بەر هەردوو دەرگاکە و هەلوور بەلورێکیان بۆ بکەم و بزانم کامیان دەرئەچێ، لە شارێکی شەش ملیۆنیا کار بگاتە سەر دوو دەرگا ئاسانە، لەگەڵ تەواو بوونی هەلوور بەلوورا دەرگای لای چەپ دەرچوو چەند جارێ لە دەرگام دا، پاش تاوێك دەنگێکی گڕ بەرزبووەوە.

ئامەد، ئامەد!!

دەرگـا كرايـەوە، كابرايـەكی بەسالاچـووی ورگـن و سەرتاسـی چاويلكە زەرەبين فانيلەيـەكی نيـو قۆڵ و بيجامەيـەكی لـە بـەرا بـوو، بـێ ئەوەی بپرسێت تۆ كێی وتی:

– بفەرما!

+ئەمە ماڵی نەجمە؟

– باڵێ بفارمايد بفەرمايد

چوومە ژوورەوە و ئەو كەوتـە پێش و منيش بەدوايا، واقم ورما بوو، هيچ تێ نەدەگەيشتم تۆ بڵی ئەمەيش ناوی نەجم بێت؟

پـاش تۆزێـك دەركـەوت مـاڵی پورزاكـەم بـوو، ئـەميش خـەزووری پورزاكەمە، دوای چەند رۆژێك گەرامەوە ئۆردوگای حسين ئاباد و داوای گەيـشتنە بارەگـای سـەركردايەتی شۆرشـم كـرد، كاروبـاری وەزراتـی كيشوەرم بۆ تـەواو كرا و رەوانـەی ورمـێ كرام بۆ گونـدێكی سنووری لەسـێ گۆشـەی توركيـا و عـيراق و ئێـران ناوچـەيەكی كوێـستانی و سـەرەتای زسـتانێكی سـەخت بـوو، بـەفر و بـۆرانێكی بـێ ئامـان و پـر بـەفرترين زسـتانی ژيـانم بـوو، لـە دوای يـەك دوو شـەو لـە ميوانخانـەی سـەركردايەتی شۆرشـگێرەكان، بانگيـان كـردم بـۆ ژووری لێكۆڵينـەوە ژوورەكە سێ كەسی تيا بوو، تـابڵێی گـەرم و بچووك، زۆپايـەكی نـەوتی لوولەكـەی لـە بنميـچی ژوورەكـەوە چووبووە دەروە، ديـوار و بنميچ بـە نـايلۆنی گوڵـدار داپۆشـرا بـوو، پەنجەرەيـەكی بـچووك و زەويـەكی پـر فەرش، هەريەكە و ميزێكی نزمی لە تەختە قيمەگەروە تر لە بەردەميانا بـوو، چـوار مـشقی لەپـشتيەوە دانيـشتبوون، يـەكێكيان بـە روخـساريا دياربوو، بەرپرسی هۆبەكەيە، سەری هەڵبری:

– فەرموو برا فەرموو!

چوومە ژوورەوە و سەلامم کرد

– فەرمووو دانیشە لە کوێوە هاتویت؟

+ کەرکوک

– بەخێربێی، ئێ باشە جەنابتان نیازی کوێتان هەیە؟

+ نیازی هیچ شوێنێکم نییە

– ئەی بۆچی هاتوویت

+ هەر بۆ ئەوەی بگەمە ئێرە

– باشە...بەخێر بێیت، ئاخر نیازت هەیە چی بکەیت؟

+ نیازم وایە ببم بە شۆڕشگێڕ

– شۆڕشگێر لە کوێ؟

+ لە هەموو شوێنێک، لە زاخۆوە هەتا خانەقین

– ئاخر برای باش شۆڕشگێڕی بەهەموو کەسێك ناکرێت ئەمە بڕیاریکی سەختە تۆ دەیدەیت.

+ دەزانم بڕیارێکی سەختە، بەڵام من لە ژێر باری ژیانێکی سەخت تر لەو بڕیارە دام، باوەڕم وایە ئەم بریارە تۆزێك باری ژیانم سووک تر دەکات.

– باشە کەوایە با چۆنیەتی ژیانی شۆڕشگێڕیت پێ بڵێم کە بە چ شێوەیەکە.

+ بەڵێ

– تۆ کە شۆڕشگێر بیت، دەبێ لە ڕۆژێکا بەلای کەمەوە دە کاتژمێر بەرێگادا برۆیت !

+ بەڵێ

– هیچ داراییەکیشمان نییە یارمەتی و موچەت پێ بدەین

+ بەڵێ

– ڕەنگە بە سێ شەو دوو کاتژمێر نەخەویت و لە وەخت و ناوەختا بەرێگاوە بیت !

+ بەڵێ

– سەرەڕای ئەو ژیانە لە ئەنجامیشدا شەهید دەبیت !

+ بەڵێ

– ئەمانەت هەموو قبووڵە؟

+ بەڵێ

ماوەی چەند مانگێ لەوێ مامەوە هەندێ ئیش و کاری ڕاگەیاندنیان پێ سپاردم بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ هەستم بە بێزاری و لاوازی و بێ هێزی دەکرد لەش و لارم دەشکا بەسەر یەکترا.

خۆم بەڕاکردوویەك دەزانی، ڕاکردوو لە کوردستان، ڕاکردوو لە فەرمانی ڕاستەقینە، ڕاکردوو لە باوەشی وڵاتی دایك، دەبوو من لەوێ دانیشم و چاوەڕوانی گوێ گرتنی هەواڵ بم سەبارەت بە چالاکییەکانی شۆڕشگێڕان و گورزی تۆڵە، من بۆچی هاتووم و چیم پێ ئەکەن؟

ئەی ئەو هەموو تۆڵانەی کە خۆم بۆ ئامادە کردبوو؟

من شەقێ بەقاچی خۆم نەیوەشێنم؟ تفەنگێ بە پەلەپیتکەی خۆم نەیتەقێنم تۆڵە سەندنەوە کەی وائەبێ؟ !

کێچ کەوتە کەوڵمەوە بۆ گەڕانەوەی وڵات، لەگەڵ هێزی شۆڕشگێڕی کوردستان ببم بە شۆڕشگێڕ. نامەم بۆ کرا و کەوتمە ڕێ بۆ مەریوان ، ئەو شارۆچکە سنووریەی کە نزیك شارۆچکەی هەڵەبجەی کورستانی خۆمانە.

## -٨-

هەڵەبجە و دەشتی شارەزوور ژیان و گیانلەبەری تیا نەمابوو بەهۆی شاڵاوەکانی حکومەتەوە. دەمەو ئێوارە بوو گەیشتمە دەربەند کەڕەجاڵ، دەربەند کەڕەجاڵ دۆڵێکی بەردەڵانی وشك بوو.

مۆڵگەیەکی بچوکی شۆڕشگێڕەکانی لێبوو، ئەو شۆڕشگێڕانەی لەوێ بوون مەنجەڵێ برنجی سووری دەم نەکێشراویان بۆ ئامادە کردین، بۆنی دوکەڵی لێ ئەهات، تێکڕای ئەو خۆبەختانەی ئامادەی ڕۆیشتن بووین بەرەو ناوچەی قەراخ چل کەس بووین.

لەگەڵ خۆرئاوا بوونا یەك لە دوای یەك کەوتینە رێ، ئاسمان تەواو تاریك داهات، من شارەزای هیچ شوێنێك نەبووم، تەنها ئەوەندەم دەبینی ڕەشی ئەرز و ئاسمان و شاخ تێکەڵ بەیەکتر ببون لە چەند مەترێك بەولاوە هیچی ترم نەدەدی.

نازانم چەند بەڕێوە بووین، بێخشپە و، بێ قسەو، بێ جگەرە کێشان، سەرەو خوارێکی پڕلە تەلاشە بەرد بوو، لەگەڵ هەنگاوێکی بەتاودا، پێی چەپم داخزاو چووە بەینی گابەردێکی قڵەشاودا، ئەژنۆی ڕاستم بەتوندی کێشای بەسەر بەردەکەیا، لە ئێشا تاریکایی هات بەسەر چاوەکانما، شەو بۆ خۆی تاریك بوو لە ئازاری قولە قاپی پێی چەپم و ئەژنۆی پێی ڕاستم ئەوەندەی تر بەرچاوم تاریك بوو پاش

تاوێك پێم ڕاكێشایەوە قولە قاپی پێم لە بەینی قڵیشی بەردەكە گیر بوو، تەڕایی خوێن گەیشتە ناو پێڵاوەكانم، قافڵەی شۆڕشگێڕەكان چەند گوریسێك دوور كەوتنەوە، یەكێك لە شۆڕشگێڕەكان بەدیار منەوە مایەوە، نەدەكرا بانگی یەكتر بكەین، ناچار دەستم لە تەنیشت پێمەوە بردە ناو شەقی بەردەكەوە و قەیتانی پێڵاوەكەم كردەوە و پێڵاوەكەم لە پێم داماڵی و بە چ هێزێك پێم چووبووە خوارەوە، بەهەمان هێز ڕامكێشایەوە، چەند پێست لە پێم داماڵرابوو، ئەوەندەی تری لێ داماڵدرا، تەواو كۆڵەداربووم بەڵام نەدەكرا بیهێنمە سەر خۆم وكاری بكەم شۆڕشگێڕەكان پێم بزانن، ئاخر ئەمە یەكەم شەو ڕێگامە و بائەوان بەلاوازم تێ نەگەن.

بە ئاسمانی لای ڕاستەوە، بڕە گوللە تۆپە ئاگراویەكانی ئێران كە لە گوندی دزلییەوە هەڵئەدران، وەك پۆلە گوڵە ئەستێرەیەك ڕووەو ئاسمانی ناوچەی خورماڵ دەڕۆیشتن، پاش كەمێك وەكو چەخماخە پارچە زەوییەكی فراوانیان گڕباران دەكرد و دەبریسكایەوە، دیمەنێكی جوان و هەمان كات سامناكی هەبوو، گومانی تیانەبوو بریسكانەوەی ئەو پارچە زەوییە كۆمەڵێك مرۆڤی دەكوشت، بەڵام ئەمە جەنگە و جەنگیش قوربانی دەوێت لە نێوان هەردوولا، با بێت یا باران هەر لە بەفر كەم دەبێتەوە، دەبێ هەر میللەت ئەم باجە بدەن.

وردە وردە لە كۆڵی ڕێگای خز و تەلاشە بەرد دەبووینەوە دەكەوتینە دامێنی چیا تا دەهات زیاتر دەچووینە قورگی تاریكی شەوەوە، من هەموو شۆڕشگێڕەكانم وەكو یەك و بۆ یەكەم جار دەناسی.

ئیتر ڕێگا پانتایی شارەزوورە و ماندوو بونێکی زۆر و ئازاری قولە قاپی پێی چەپیشم هەراسانی کردبووم.
نزیکی بەرەبەیان گەیشتینە دەم رووباری زەڵم، سەرچاوەی زەڵم لە گوندی ئەحمەداوای بناری چیای سورێن وکۆتایی دەربەندکەرەجاڵەوە هەڵدەقولا، لەوێ کەفی دەچری لە نزیك گوندی زەڵم هێمن هێمن شەپۆلی دەدایە بن داربییەکان لە ڕەندێکی قولایی ئاوەکە کە دەگەیشتە پشتێنە پەرینەوە و لەناو بییە چرەکانا ئاگرێکی بچوکمان کردەوە هەندێك ساردی لەشمان پێدەرکرد و جلەکانمان کزرکردەوە. لەگەڵ گزنگدا خۆمان گەیاندە گوندە ڕماوەکەی زەڵم، یەك دوو ژووری ئاژەڵ مابوونەوە نەڕوخا بوون، کاوکۆتەڵ و پوش و پەلاشیان تیابوو، لەسەریان ڕاکشاین و سەرمان خستە سەر لەشی یەکتر تا خۆرئاوا بەچاو خەوتوو بەدڵ وریا ماینەوە.
ئێوارە لەشم وەك لاستیکە کۆن جیڕ ببووەوە، بە زۆریش ماسولکەکانم کێشیان نەدەهات، قەتارەی شۆڕشگێڕەکان بەڕێ کەوتەوە، تاریك داهات و چاو تەنها سەر لوتکەی لووتی دەبینی کەوتینە ناو گژوگیایەکی ڕیشاڵدارەوە وەکو بەن لە پییەکان دەئالان.
جاروبار لەسەر بەردێکی خڕ هەڵدەگلام، چەند جارێ بەلادا هاتم و ڕمام هەرمن وانەبووم، زۆربەی شۆڕشگێڕکان دەکەوتن.
نازانم ئەو هەموو بەردە خڕە چیبوو ملمان لێ نابوو، جارێکی تر لەسەر بەردێك هەڵگلام و کەوتم بەسەر بەردێکی تردا، بەردەکە کەوتە ئاستی سەرسنگ و ژێربالم، تۆزێ دەستەکوتێم بەسەر و گوێلاکی بەردەکەیا هێنا، لەبەرد نەدەچوو، هەڵم گرت و خستمە باوەشم، بڕەگیایەکی پەلکدار لەگەڵیا هاتە باوەشم، کە چاك لێی ورد بوومەوە،

دەبینم ئەمەی چەند جار لەسەری هەڵگلابووم بەرد نەبوو، ئەمانە هەموو شوتی بوون و ئێمە بەناو بێستانە شوتیدا دەڕۆیشتین، نەك بەردەڵان و چەم، لەم پایزە درەنگ و پڕ تەڕ و تووشیە و ئەم شووتیانە تێنەدەگەیشتم، بێستانی بەجێماوی گوندە چۆڵکراوەکانی شارەزوور بوو، شوتیەکەم دا بەسەر زەویدا و شەق و پەقم کرد، بەتام ترین شووتی بووله ژیانمدا، شۆڕشگێڕەکان وەك کەوتبێتنە ناو کۆمەڵە کوپە لیرەوە، هەریەکە و شوتییەکی گرتبوو بە دەستییەوە، تەپ و هوڕ کەوتنە داڕزاندنی، دەتگوت ئەمە دوا ژەمی ژیانیانە و جارێکی تر خواردن بە چاو نابینن، پاش خواردنی شووتی، یوسف دوو پارچە توێکڵە شووتی وەکوکڵاش خستە بەر پشتێنەکەی و ئەیوت:

ژیربن گیرفان و باخەڵی لێ پرکەن ئەمە بۆتەنگانە و برسیەتی قسەی تیا نییە، کوڕە ژیربن بەخوا بەکەڵکی کاتی خۆی دێت.

کەس لە شۆڕشگێڕەکان بە قسەیان نەکرد، بەڵام من ئامۆژگاریەکەیم پەسند کرد، چونکە یوسف دوو ساڵ بوو شۆڕشگێڕ بوو، هەرچۆنی بێ ئەزموونی لەمن زیاتر بوو. بەپەلە چەن پارچە شووتیەکم کراندەوە و تۆکڵەکانم خستە باخەڵم، دیسان کەوتینە رێ و چووینە ناو جەرگەی شەوەوە، دەمە و بەیانی بەرلەوەی چاوم بە هیچ گوند و ئاوەدانییەك بکەوێ، گوێم لە قوولەی کەڵەشێربوو، پاش تاوێك گوندی دەرەبەند فەقەرە دەرکەوت دووکەڵی ئاگردانەکان بەبارێکی ئەچوونە ئاسمان، دەستم کردە باخەڵم و توێکڵە شووتییەکانم توڕدا، گەیشتینە ناو گوند.

دەربەند فەقەرە دوایین گوندی ئازادکراو و ئاوەدانی ڕۆژهەڵاتی ناوچەی قەراخ بوو لە یاڵ بەو دیواو ڕووی کردبووە دەشتی شارەزوور،

لەوێ لامان نەدا لە یاڵماندا و ئاودیوی گوندی نەوتی و شیوقازی بووین، کۆتایی پایز بوو قەد و لاپاڵ و تەختاییەکان یەکسەرە قەیفەیەکی زەردیان پۆشیبوو، درەختی چڕ و چیای سەرکەش و ئاسمانی شینی قەراخ دیمەنێکی دڵگیر و زیندووی دەبەخشییە ناوچەکە و مرۆڤ هەمیشە هەستی بە ئارامی دەکرد. لەوێدا بارەگای سەرەکی شۆڕشگێڕەکان لە قۆپی جافەران دامەرزا.

بڕیار بوو لەگەڵ ئەرکی شۆڕشگێڕیدا وەکو دکتۆرێکی شۆرش کاری برین پێچی ئەنجام بدەم.

لە بارەگا دەستکرا بە دروست کردنی دوو هۆدە، کە بکرێت بە بنکەی تەندروستی و چارەسەری بریندارەکان، منیش ژووری بێتەلم کردە خانەخوێی خۆم تا ژووری تەندروستی تەواو دەبێ.

سەرپەرشتی کردنی ژووری بێتەل لە ژێر دەستی عەدە سوورا بوو، عەدە سوور هاورییەکی منداڵی خۆم بوو، لەوێ ببو بە بێتەل و پێیان دەگوت (عەدنان بێتەل) عەدە لاوێکی ڕوو خۆش و سادە و بێ فێڵ بوو، هەمیشە حەزی لە گاڵتە و نوکتە وبەسەر بردنی کاتی خۆش و خواردنی خۆش دەکرد لە نەوسنییا ناوبانگی دەرکردبوو لەناو شۆڕشگێرەکانا.

شەوێ من بە دیار چرانەوتییەکەوە سەرگەرمی خوێندنەوەی نامیلکەیەکی شیعر بووم، بەناوی ملوانکەی شین لە نووسینی (شەریف).

عەدە لەسەر ئامێرە بێتەلە ڕاکاڵەکە خەریکی گەیاندن و وەرگرتنی زانیارییەکان بوو بۆ سەرکردایەتی، چەند جارێك بە دەنگ هاواری بۆ کرد، چوارسێ، چوارسێ، چوار سێ، چوار سێ

چـوار سـێ مەبەسـتی لـە چـل و سـێ بـوو ئینجـا دەسـکە میکرۆفۆنەکەی دانا و دەستی کردە بەکارهێنانی مۆرس،

تو تو توو، توتتووت.

زۆر بێزار بووم لەو توتە توتەی عەدە وتم:

+ ئەریٚ نەبڕایەوە مـردوت مـریٚ؟! ئـەریٚ بێـزار نـەبوی؟.. مێـشکت نەچوو؟ دەبەسە؟

عەدە بێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە:

– ئەها ئەهـ، ئەوە تەواو هەر ئێستا تەنها ئەم دێڕەم ماوە.

پاش جگەرە خۆرێك ئامێرەکەی کوژاندنەوە و لەسەر کورسییەکە هەڵسا و ڕووی کردە من و :

– ئێ دکتۆر ئەو نامیلکەیەت بە دڵە؟.

+ خراپ نییە

قسەکەی گۆڕی و وتی:

– هەواڵێکی خۆش!..

+ هەواڵی چی؟

پێـشتر وامزانـی بـە بێتـەڵ هـەواڵی رزگـارکردنی جێگایـەکی وەرگرتووە.

کەچی وتی:

– سبەی مەڕێك سەر ئەبڕن بۆ شۆرشگێڕەکان!

+ ئی؟!

–ئێمەش ئەچین بەدیار کەوڵ کردنەوەکەیەوە ئەوەستین.

+ ئینجا ئێمە بۆبچین؟ ئەی خۆیان بەشی ئێمە جیاناکەنەوە؟

- با جیای ئەکەنەوە، بەڵام من مەبەستم سەر و پێکەیەتی، بۆخۆمان ئەیهێنن و دوو قوڵی چاکی ئەکەین و بۆ سبەی نیوەڕۆ لێی ئەنێین، چونکە لەوەتای بووم بە شۆڕشگێڕ و ماڵەوەم بەجێهێشتووە، تام و چێژی سەروپێم لەبیر چووەتەوە.

زۆرم هەوڵدا کە لەو کارە پەشیمانی بکەمەوە چونکە سازکردنی سەروپێ زۆری دەویست بەڵام بێ سوود بوو، نەوسی عەدە بەمن بەربەست نەدەکرا.

سبەینێ لەگەڵ مریشکەکانی عەدە سوورا لەخەو ڕاپەڕین و بەرەو خوار بووین بۆ گەرمەسێری حەیوان سەربڕین، زوو لە خەو هەڵسانمان ئازایەتی خۆمان نەبوو، ئازایەتی کەڵەشێرە پۆپنە تەوراسییەکەی عەدەبوو، عەدە کەڵەشێرێك و دوو باڕۆکەو مریشکێکی سەرەو کۆمەڵی جووجەڵەی لە کولانەیەکی بچووکی تەنیشت ژوورەکەی خۆیا بەخێو دەکرد.

دەمە و چێشتەنگاو مەڕە سەربڕاو سەروپێچکە و گۆشتەکەمان بردە سەر کانییە وونەکەی کە لە بەینی قلیشی شاخە ماهیزەر دەکەوە ئەهاتەدەر سەر و پێ و ورگ و شیلاوك بەپوختەیی چاك کرا، هەموومان خستە تەنەکەیەکی بەتاڵی شانزە کیلۆییەوە، دار بەڕوویەکی زۆرمان بۆ هێناو ئاگرێکی گەشمان بۆ کردەوە، دەم و دەس گۆشتەکەمان هەڵکزان و خواردمان، تاکاتژمێر یەکی پاش نیوەڕۆ پتر لە بیست جار عەدە هەرجارە و پییەکی دەرئەهێنا و نقورچێکی لێ ئەگرت و ئەیخستەوە ناو تەنەکەکە، جار جار بۆڵەیەکی لێوە ئەهات و ئەیوت:

ئەمە سەروپییە یا تایەی تراکتۆرە؟

سەروپێ هەرنەکولا، نانی نیوەڕۆمان بە ئاوەکەیەوە خوارد بەردەوام دارمان خستە ژێری تا بانگی ئێوارە.

عەدە بێ تاقیکردنەوە دایگرت، منیش دەستم دایە گوێچکەکەی و تۆزێ ڕامکێشا، کولانی چی؟! هێشتا ئەیباڕان عەدە وتی:

- نەشکولا بێ کولاوە، سەروپێش تۆزێ دان نەگرێ بە کەڵکی چیدێ؟!

نانەولاوی چاکمان بۆ کرد لە تەشتێکا و سەروپێمان کرد بەسەریا، تەنها بۆنی هەلاوەکەی نەبێ لە تام و چێژا بە هیچ شێوەیەك لەسەروپێ نەدەچوو، هێشتا دووپاروو نانم نەخواردبوو پێیەکم هەڵگرت و گازێکی توندم لێگرت دەست و پەنجەکانم لیقن و لووس ببون لای سمەکەیم لە بەینی دانەکانم توند کرد و ئێسکەکەیم لابەلا بە دەست ڕاکێشا. ڕەگی پێیەکەی یەك بست درێژ بووەوە هەر نەپسا، لە پڕ لەبەینی پەنجەکانم خلیسکا و بەهەموو هێز وەك لاستیك گەڕایەوە و کێشای بە لاچەناگەما ئیتر بەرچاوم تاریك بوو، دەمم کرایەوە و لیك و پارووی جووراو بەدەم و لێوما شۆڕبوەوە، سەرم بە گێژا ئەهات ئیتر نانم بۆ نەخورا کاگێرەم لە کارکەوت تا ئێوارەی ڕۆژی دوایش وەك ڕۆژوان مامەوە قسەشم بۆ نەئەکرا. لاچەناگەی ڕاستم وەك جێ بۆکسێك مۆرهەڵکەڕا بوو، عەدە دڵی ئەدامەوە ئەیوت:

- دەیەلا گوێی مەدەرێ گریمان دەستەی هێرش بوویت و لەگرتنی مۆڵگایەکی دوژمندا برینداربوویت، منیش هەر ئەوەندەم بۆ ئەکرا دوعای لێ بکەم و خوا و پێغەمبەر بکەم بە گژیا.

چەند ڕۆژێ لەوە دوا هۆدەی بنکە تەندروستی یەکەی خۆم تەواو بوو بنەوبارم گواستەوە بۆ جێگاو ڕێگای خۆم، پاش گەیشتنی داو

دەرمـــان هاولاتیـــانی گونـــدەکانی تافـــان و ســـەرکۆ و جافـــەران و چوچانیەکان بۆ چارەسەر دەهاتنە لام، دەرمانی شۆڕش بوو بە خۆڕایی چارەسـەرم دەکـردن، ئـەوانیش لـە پـای ئـەوە گـوێز و هـەنگوین و رۆنـی خۆماڵییان بۆ ئەهێنام.

ژوورەکان نسرم بوون پاڵیان دابوو بە بنـاری شـاخەکەی قوڕگـەی دەربەنـد جافەرانـەوە، زۆر سـارد و نـزم و سـەخڵەت بـوو، بـۆ ڕەشـەوڵاخ نەبێ بە کەڵکی هیچی تر نەدەهات، بۆ تۆزێ خۆهەڵخەستن لەبەر هەتاو پـەرتووك و ڕادیۆکـەم هـەڵگرت و لای پـشتەوە چـوومە سـەر سـەربانی ژوورەکەم، تا دەمەو ئێوارە ئازاد و ڕەحیم هاتنـەوە، ئازاد و رحیم دوو شۆرشـێگری بـرین پـێنج بـوون پێکـەوە کارمـان دەکـرد و هـەرجارە و دوانمـان لەگـەڵ هێزەکـان دەچـووین بـۆ چالاکی. ئازاد لاوێکـی سـوور پێـستی کورتـە بـالا بـوو، جـێ زیپکـەی عازەبـە لاڕوومەتـەکانی کونجرکونجر کردبوو ئەو بەردەوام حەزی لە گاڵتە و پێکەنین بوو، بەلام ڕەحیم بالابەرزێکی ڕەشتالەی چاو زیت بوو، منداڵی خانەقین و فەیلی بوو ئـەو هەمیشە بواری بـۆ بڕەخسایە، باسـی کـۆن و ئازایـەتی بـاوك و مـام و ڕابردووەکـانی نـاو بێـستانی خورمـا و ڕەزەکـانی خانـەقینی ئەگێڕایەوە. سـەروبنی هـەر باسێکی شـەوێکی تـەواوی ئەویـست، بـەلام وەك چیرۆکێکی خۆش و پەسەند بوون.

## -٩-

ئەو بەیانییە بە دەنگی خوڕەی ئاوی ناو ژوورەکەم بە خەبەرهاتم، لەسەر قەرەوێڵە شکاوەکەی کەلەوێرانەکانی شارۆچکەی قەراخ هێنا بووم نوستبووم هەڵسام و پەتووەکەم لابردو پییەکم خستە زەوی تا قولە قاپی پێم نوقمی ئاو بوو، لادیواری ژوورەکەم کە بریتی بوو لە شاخەکە، کانییەکی لێ تەقیبوو ئاشگێڕێ ئاوی لێ دەرئەچوو نازانم ڕەحیم چۆن بە ئاگانەهاتبوو ئەو لە سەرپشت لە زەوی نوستبوو هەردوو دەستی خستبووە ژێرملی تەنها نووکی پەنجەکانی پێی و توێژێکی سەرسنگ و دەم و چاوی بە دەرەوە بوو، دەتگوت لاشەیەکە و کەوتووەتە سەر ئاو، حەقیشی بوو بەخەبەر نەیا، ئاوی کانییەکە گەرمی شلەتێن بوو، کێ دەڵێ خەو بە مەولەوان کردنی رووباری ئەڵوەندەوە نابینێ.

دەنگێك لە دەرەوە بانگی دەکرد:

+دکتۆرەکان!. دکتۆر!..

دەنگەکە چەند جارێك لەگەڵ چیاکەیا دەنگی دایەوە دەنگی سەرلەشکرەکەمان بوو لە دەرگاکە سەرم بردە دەرەوە، بەپەلە وەلامم دایەوە.

– بەڵێ قوربان ئەمرکەن.

+ دوانتان خۆتان بپێچنەوە و خێرا بەڕێکەون.

بێ ئەوەی بڵێم بۆ کوێ وتم:

– باشە، هەر ئێستا

لەگـەڵ ئـازادا خۆمـان پێـچایەوە و تـاقم و تفـەنگ و دەرمـانی پێویـستمان هـەڵگرت و بەڕێکـەوتین ئـەو چـەند شۆڕشـگێڕەی لەگـەڵ سەرلەشـکر دابـوون بـە تێکـەڵ و پێکـەڵی و بـڕە بەڕێـدا دەڕۆیـشتن، سەرلەشکر نەڕاندی بەسەریاندا.

ئەمە ڕێ و ڕۆیشتنی شۆڕشگێڕە؟

تۆزێ جوان بە ڕێدابڕۆن لە شتان داوەشێ!

یەك لە دوای یەك بڕۆن ! دەی!..

تۆزێ بێدەنگ بوو ئینجا لەبەر خۆیەوە: شەرمیش ناکەن.

بە ڕێکەوتین بۆ ئەودیوی چیای سەگرمە ڕووە و ڕۆژئاوا و شارۆچکە ڕووخاوەکەی سەنگاو لە تێکڕای ئەو شارۆچکەیە لە جیاتی دانیشتوان و دوکان و بازار و گەڕەك و بان و ئاوەدانی، سەنگاو لەگەڵ زەوی یەك خرابوو، تەنها سەربازگەیەکی گەورە و چەند تانکێك و خومپارە و تۆپی دور هاوێژی حکومـەتی لێ بوو، وردە وردە بەرەو گوندەکانی هـەنارە و کرپچنەیا شۆڕبوینەوە.

کرپچنە مەڵکەنی پێشووی شێخ بوو، نازانم شێخ چۆن تەکیەی گەیاندبووە ئەوێ، ئەو تەکیەو مۆڵگای سەرەکی کەرکوك بوو.

لەگەڵ گەیشتنی ناو گوندی کرپچنەیا کاتی مردنەکەی شێخم هاتەوەیاد.

لەگـەڵ جـوامێر و هێجرانـی هـاورێم خۆمـان گەیانـدە مزگـەوتی ئیسکان لەسەر شەقامی گشتی کە بەرەو سلێمانی دەچوو، لە ڕۆژهـەلاتـی کنیسەکەی گەڕەکی خۆمان، تا دەهات حەشامات زۆرتر دەبوو، کۆمـەڵێ

پاس کەپشتەوەیان بە تەختە دروست کرابوو، بەرەنگاو ڕەنگیش نەخشێنرابوو، هەریەکە و ئالایەکی گەورەی سەوزیان بەسەرەوە بوو، گەیشتنە جێ. هەموو نەفەرەکانی دەروێش بوون دەیانگوت: ئەمانە دەروێشی شێخن و لە شارەکانی سنە و سەقزی ئێرانەوە بۆ پرسە هاتوون. بەلام چ دەروێش! هەموو پیاوی یەکەیەکە و کەتەو مل ئەستوور و شینە زەلامی قژ درێژ، لە ناخی دڵەوە لێ یان دەترسام. بە بۆچوونی خۆم دەمگوت:

ڕەنگە ئەمانە لە نەوەی دێوبن، ڕەنگە ئەمانە بتوانن لە ڕۆژی حەشرا بە زەبری ئەو شمشێرەی دەستیان دەرگای بەهەشت بشکێنن و ڕێگا بۆ موسڵمانان خۆشکەن تا بچنە ژوورەوە.

کە هاتنە خوارەوە لە پاسەکە، چەن دەروێشێك بۆ بەرکوڵی زیکر پەلاماری بەردە خڕەکانی قەراغ شەقامەکەیاندا و چەندین بەردیان دایە بەر قەپ، لەگەڵ گازلێگرتنی بەردەکەیا تۆز و وردە بەرد لە ملاولەولای لغاوەیانەوە دەرئەپەڕی، کاربەوە نەگیرسایەوە، هەموو سەریان لێ ڕووت کرد و هەریەك بە جۆرێ سۆزی دەکرد، جار و بار هەموو پێکەوە پڕبەسیەکانیان هەوایان هەڵئەمژی و دووبارە هەواکەیان دەرئەپەراند و ئەیانوت: هووو. .

ئینجا نرکەی دەف و تەپڵ ناوسکی مرۆڤی دەلەرزاند، زیکر گەرم تر و گەرمتر بوو، کۆمەڵێك چەندین سیغیان لە گوپەکانیان دیواو دەر کردبوو وەك سیغی سەر شانی گای ئیسپانیە گاکوژەکان دەلەرینەوە، هەندێکی تریان جووتێ خەنجەریان لە تەوقی سەریان داکوتیبوو لە شاخەکانی فولازەری دێوی فلیمەکەی ئەمیر ئەرسەلان دەچوون کە کاکم بۆی دەگێرایەوە هەروەکو ئەویش ڕمبازی و

*جریدبازی یان دەکرد کە بەڕێگای چوونە تەکیەی ئازادیەوە زکریان دەکرد داوای شوشەی شیر و بیبسی و پیالە و کاسە و کەوچك و گلۆپی نیۆنیان لە ماڵەکانی دەم شەقامەکە دەکرد و وەك گوێز و گەزۆ و خەیار دایاندەپاچی، حەشاماتەکە هەندێکیان ئەمەیان بەهێزێکی خودایی دەزانی و تێی ڕامابوون هەندێکیش بەکارێکی شێتانە و دەجاڵ و سیحر تێیان دەڕوانی.

پاش مردنی شێخ کوڕەکەی هاتە جێگای باوکی و دەروێشەکانی خستەوە ژێرباڵی خۆی.

خەیاڵەکانی کۆنم پساند و گەڕامەوە کرپچنەی حازری. لە کرپچنە دەیانگوت کوڕەکەی جاروبار هاتوچۆی ئێرەش دەکات و کۆنە تەکیەکەی باوکی بەسەر ئەکاتەوە.

گوندەکەمان بە جێهێشت لەوێوە بۆ کچان و سەرقەلا شۆڕ بووینەوە بەرەو گوندەکانی قەیتول و جەباری هێزێکی سەد و پەنجا کەسی بووین بە هەموو شۆرشگێرەکانی خۆمانەوە کە لە گەرمیان بلاو ببونەوە، ئامادەی تۆمار کردنی چالاکی بووین، دەمانزانی کە سەر لەشکرەکانمان دەیانەوێ گورزێك لە حکومەت بوە شێنین، بەلام نەماندەزانی کەی و لە کوێ ئێوارەیەکیان هەموو هێزەکانمان گەیشتینە نزیك هێزە چەکدارەی کە لە بان مەقان بەسەر بەرزییەکەی ڕۆژئاوای شارۆچکەی چەمچەماڵەوە بوو، ئەرکی ئەو هێزەی حکومەت ئەوەبوو کە چاودێری و پاراستنی ئەو کۆمەڵە شۆفل و بلدۆزەر و ئامێرە بگرنە ئەستۆ کە ڕۆژانە لەگەڵ لەشکری سەربازی و تانك و هەلیکۆپتەرا گوندەکانی کوردستان بڕوخێنن و دانیشتوانیان تار و مار و دەربەدەر بکەن نیازی ئێمەش لەناو بردنی ئەو ئامێرانە بوو، شۆرشگێرەکان بە

ناو جەرگی تاریکی شەوا تەواو چوونە پێش، تا هەر پۆلە و گەیشتنە نزیك چەند مەترێك لە مۆڵگاکانی ئەوان.

لە کاتژمێری سفردا قرمە و گرمەی (R.B.G )گوێی شەوی کەڕی کاس کرد بڵاچە و چەخماخەی ڕەگبار قەدپاڵ و گرد و دۆڵی سوور هەڵگەڕان ڕەشاش بیکەیسیەکانمان هەموو پێکەوە دەڕشانەوە و مۆڵگاکانیان ئاگر پرژێن دەکرد هاوار و ناڵەی پیاوانی ڕژێم تێکەڵ بە یائەللا و حەی و مەدەد و دەبوون لە ماوەیەکی کەمدا شۆرشگێرەکان دەستیان خستە سەر دەمی مۆڵگاکان و نقەیان لێ برا.

پێکراوێکی زۆر لە ناوەوە و دەرەوەی دیوارە بە گونیە هەڵچنراوەکان لاشەیان کەوتبوو، ئیتر ماینەوە هەر خۆمان و ئامێرەکان و کۆمەڵێ دیل و ئامێرەکان سووتێنران، دیلەکان ڕەوانەکران بەرەو مۆڵگاکانی خۆمان لە قەراخ لەگەڵ سێ شەهید و چەند برینداڕێك..

پاش ماوەیەك خۆمان بۆ چالاکییەکی تر کۆکردوە، ئەم چالاکییەش هەر لە سنووری گەرمیاندا بوو، پێدەچوو بۆ هەڵمەت بردنە سەر هێزەکەی پردی باسەرەی ڕێگای چەمچەماڵ و سەنگاو بێت، هێزەکانمان لە گوندەکانی ژاڵە وکانی چنار و کانی بناو ئەحمەدلەوەن و تەپەسوور و هەشەزینی ناوچەی هەمەوند بڵاوبوونەوە.

هەرواش دەرچوو لە شەوێکی دیاری کراودا هەڵمەتی شۆرشگێران دای بەسەر شەش مۆڵگا و هێزێکی دوژمندا کە دەیپروانییە سەر پردەکەی باسەریا لە ماوەی کەمتر لە کاتژمێرێك بارەگای هێز و مۆڵگاکان وەك ناولەپی بەتاڵی لێ کرا.

هێرشەکە بە چەندین کوژراوی ئەوان و گرتنی نەوەت و پێنج دیل و چەك و تەقەمەنیەکی زۆر و چوار شەهیدی خۆمان کۆتایی پێهات.

چەند مانگێ لەوەدوا، نەخشەی پاککردنەوەی هێزێکی تری دوژمن دارێژرا لەناوچەکە، ئەو هێزە لەسەرهەمان ڕێگای چەمچەماڵ و سەنگاو بوو، نزیکەی دە ڕۆژ سەرلەشکر و بەرپرسە سەربازییە شۆرشگێرەکان، بە دوو بەش هەرجارە و لەلایەکەوە، چاودێری بەرزاییەکانی دەور و بەری مۆڵگاکانی دوژمنیان دەکرد، بەو شێوەیەی خەڵکی ئاوایی یەکان باسیان لێ دەکرد گرتنی ئەو هێزە هەروا ئاسان نەبوو بۆیە دەبوو وردەکاریەکی زیاتری بۆ بکرێ، بارەگای هێزەکەی دوژمن بەسەر گردێکی قوتەوە بوو، قەدپاڵی گردەکە لە هەموولاوە لە گۆشەی چل و پێنج دابوو لە ڕووی ئاسۆیی زەوی یەوە، بەکرەگڵێکی خز و پیاهەڵزنانی مەحاڵ بوو تەنها ڕێگایەك شۆرشگێر بگەیەنێتە ناو بارەگاکە ڕێگای دەرگای چوونە سەرگردەکە بوو.

لە شەوێکی ئەنگووستە چاوی بێدەنگدا، هێزەکانمان گەیشتە گوندە ڕماوەکەی نورە کە قۆناخێ دوور بوو لە مۆڵگاکان و دیدی هێزەکانی دوژمن.

بەرنامەڕێژی ئەو شەوە لە چالاکی یەکانی ڕابردوو ئەندازیارانەتر بوو، هەر مۆڵگایەکی ئەوان دوو دەستە شۆرشگێری بۆ دانرابوو، دەستەیەك بۆ هێرش، دەستەکەی تر لە پشتەوە، دوو رەشاش بیکەیسی یەکێان لە ڕۆژهەلاتی مۆڵگاکە و یەکیان لە ڕۆژئاوای دەستەیەکی دە شۆرشگێری بۆ هێرش دەستەیەکی تر لە پشتەوەی ئەوان، چوار رەشاش بیکەیسی بۆ بارەگای هێزەکەیان و ئەگەری بەرگری و سەرکوت کردنیان، کاتژمێری سفر لە یانزەی شەو دەستی پێکرد. هاوڕەو ناڵەی (ئار پی جی)، دڵی زەمینی لەرزاند و تێکەڵ بە

هاوار وناڵەی پیاوانی ڕژێم و هەڵڵای بەرپرسە سەربازییەکانی خۆمان دەبوو.

لێیان دەن.. هێرش بەرن.. شێرەکوڕانی دوژمن بەزێن، نەیەڵن چاوبکەنەوە.. هەڵمەت بەرن. .

لە کاتژمێر یانزە و پێنج خولەکدا مانگە شەو لە کەل دەرکەوت، جووڵە و هەڵس و کەوتی پیاوانی رژێم بە چاکی دەردەکەوتن.

فیشەکێك تەوێڵی ڕزگاری پێکا رزگار لاوێکی پانزە ساڵی خەڵکی چەمچەماڵ بوو، پاش ئەوەی دایکی کۆچی دوایی کردبوو، باوکی دوای ماوەیەکی کەمدا لەگەڵ بێوەژنێکا زەماوەندی کردبوو، ئەوەندەی نەخایاند باوەژن ڕزگاری هەراسان کرد و لە ماڵە بچکۆڵەکەی باوکی بەدەری نا، ئەمیش ناچار بوو خۆی خاوەنی خۆی بێت و ڕێبازی شۆرش و خەبات بکاتە ماڵە باوانی خۆی، توانا و زیتەڵی و ئازایەتیەکەی لە قەوارەی خۆی گەورەتر بوو، لەهەر چالاکیەکدا بۆ دەستەی هێرش و پێشەوەی بەرەی شەڕ تەرخان نەکرایە، بە ڕەوشتە منداڵانەکەی دەگریا و ئەو ڕۆژە مانی لە ڕووخۆشی و پێکەنین و خواردنیش دەگرت. کە کەوتە سەر گازەری پشت، روخساری وەك تەختە بەردەکان کەتریفەی مانگە شەو لێی دەدان سپی هەڵگەڕا.

رزگار بۆ رزگاری کوردستان خۆی بەختکرد. بۆ سەرفرازی شەوانی باوەژن و باوکی بێویژدان تا ژیانێکی بیَ ڕزگار بەسەربەرن سەری نایەوە، ئەو لەبیرکردنەوەیەکی بێهودە و گێژاوی بازنەیەکی داخراو ڕزگاری بوو.

لە ماوەی بیست خولەکدا کۆتایی بەهێزەکەی دوژمن هات، نزیکەی حەفتا دیل و پتر لە هەشتا کوژراو دەسکەوتی چەك و

تەقەمەنی هێزەکە و پێنج ئۆتۆمۆبێل و دوو زرێپۆشی دوژمن، زیانی ئێمە نۆ بریندار سووك و دووبریندار قورس کە شێخە و مەلا هێمن بوون لەگەڵ شەهید بوونی چوار شۆڕشگێڕ ئەنجامی شەڕەکە بوو، لەگەڵ پشتیوانا دەستە ساردەکانی ڕزگارم گرت و ئەویش پێیەکانی، خستمانە ناو گالیسکەی تراکتۆرەکەوە، بەر لەوەی ناوچەکە جێ بهێڵین تۆپــە دوورهاوێـــژەکانی حکومـــەت لەســـەربازگەی شارۆچـــکەی چەمچەماڵەوە باران کوت کەوتنە تۆپبارانی هێزە دەست بەرسەرا گیراوەکەیان، ئێمە بەپەلە ناوچەکەمان بەجێ هێشت، ئازاد لەگەڵ بریندارەکانا بەتراکتۆرێك ڕۆیشت و منیش لەگەڵ سێ شەهیدی خۆمان لەگەڵ تراکتۆرێکا سەرکەوتم کە پێشتر ئەو دوو تراکتۆرەمان لەگەڵ خۆمان هێنا بوو لە دواوە ڕامانگرتبوون، لە سەرتایەی تراکتۆرەکە لە نزیك شوفێرەکەوە دانیشتم، بەڵام دوێنێ شەو و ئەمشەویش خەو نەچووە بووە چاوم.

دوێنــێ شەو لە مزگەوتەکەی گوندی (جانی) لە نزیك زۆپا داریەکەوە ڕاکشابووم تا بەرەبەیان سی و پێنج ئەسپێم لە باخەڵ و بەرپشتێنەکەم دەرهێنا و پێشتر لەبەر چرا بچکۆلەکە دووجار هەڵاو دیووم ئەکرد و لەسەر پشت و ورگە هەڵاوساوەکەی ورد دەبوومەوە ئینجا دەمخستە سەر زۆپا داری یەکە، پاش کەمێك وەك برێشکە ترقەی دەکرد و ڕای دەچلەکاندم، ئەمشەویش ئەوەتا لەم حاڵەدام، هەرچیم دەکرد خۆم بەسەر ئەو تایەی تراکتۆرەوە نەدەگرت، ناچار بە ئاسنی نێوان تراکتۆر و کالیسکەکەدا هەر بەرێوە چوومە ناو کالیسکەکە و خۆم خستە نێوان شەهیدەکانەوە و گوێ یەکی پەتووەکەم ڕاکیشایە سەر پێیەکانم.

به دەنگی کردنەوەی دەرگا ئاسنەکەی کالیسکەکە بەخەبەر هاتم، ئاسمان تاریك و ڕوون بوو ڕاست بوومەوە لە بەینی هەردوو شەهید دانیشتم حەوشە گەورەکەی ماڵی سەیمحەمەدی شۆڕشگێڕی خۆمان بوو لە گوندی جەباری، کابرای هاوڵاتی کە دەرگاکەی کردبووەوە، هەتا پێی کرا بەرەودوا ڕایکرد، بەجۆرێ حەپەسا یەك وشەی لە دەم بۆ نەئەهاتە دەر، تەنها ئەیوت ئەو.. ئەو.. ئەو پەنجەی بۆلای من درێژ دەکرد و ڕووی دەکردە شۆڕشگێڕەکان و ڕووی دەکردەوە من منیش لە حەپەسانەکەی ئەو حەپەسا بووم، ترسی ئەوەم هەبوو ببم بە هۆی شێت بوونی ئەو کابرا هەژارە، منیش هیچم بۆ نەئەوترا، تا شوفێری تراکتۆرەکە چووە لای و دەستی گرت و وتی:

کورە برا ئەوە شەهید نییە ئەوە دکتۆرە، دکتۆر، ئەو زۆر ماندووبوو لە ڕێگا خۆی پێ ڕانەگیراو چووە لای شەهیدەکان و لەوێ خەوی لێ کەوتووە.

ئەو حەقی بوو بتۆقێ، ئاخر من ئاگام لە خۆم نەبوو لاشانم بەخوێنی تەوێڵی رزگار شڵپەی دەهات، بۆیە وای زانیووە شەهیدە و زیندوو بووەتەوە.

شەهیدەکانمان داگرت و دەستمکرد بە پڕکردنەوەی جێ فیشەکەکەی کەللەسەری رزگار بەلۆکە، بۆ ئەوەی لەوە زیاتر خوێنی لێ نەچۆڕێ، روخساری رزگار وەك هەمیشە پێدەکەنی، شادی و دڵخۆشی سەرکەوتنی پێوە دیار بوو، دڵی منیش بۆ پێکەنینەکەی ئەو کوڵ کوڵ دەگریا، پاشان چوومە هاوکاری ئازاد کە خەریکی تیمارکردنی برینەکانی شێخە و مەلا هێمن بوو، ئەوان برینەکانیان سەخت بوو شێخە فیشەکێك لای چەپی سەرسنگی گرتبوو سی پەلکی کون کردبوو

لە پشتەوە دەرپەریبوو، لە کونی جیٚ فیشەکەکەوە لەسەر کۆڵنجەوە هەناسەی دەکیٚشا و فیشکەی ئەهات، هەناسە لە دەم و لووتی بڕابوو بیٚهۆش و لە زمان کەوتبوو پاش دوورینەوەی جیٚ فیشەکەکە هۆشی هاتەوەبەر چەند دەرزی یەکی دژە خویٚن ریٚژیم بۆ کرد.

بەڵام هیٚمن هۆشی بە خۆیەوە هەبوو قسەی دەکرد، دەیوت:

-دکتۆرگیان من باشترم، جاریٚ لەگەڵ شیٚخەیا هەوڵ بدەن با نەمریٚت!

هیٚمن نەیدەزانی سەختی برینداری پەیوەندی بە قسەکردن و نەکردنەوە نی یە، بەڵکو برینکەی هیٚمن زۆر لە برینی شیٚخە قورس تر بوو، هیوای ژیانی نەبوو چونکە ئەو فیشەکەی لەلای چەپی گریٚ ملیەوە پیٚکابووی، یەکسەر ئیٚسکی بڕبڕەی پشت و شویٚنە کرکڕاگەییەکانی بڕیبوو، لەلای پشتەوەی بن باڵی ڕاستی یەوە دەرپەریبوو، ئەو ئەندامە کرگراکەی یانەی دەبوونە هۆی نەگیرسانەوەی خویٚن ڕیٚژی ناوەوە، شەهیدبوونی گومانی تیا نەبوو.

هەر چۆنیٚ بیٚت ئەوەی بۆمان کرا کردمان و بە پەلە هەردووکیان خرانە ئۆتۆمبیٚلە لاندکرۆزەکەی کە لە چالاکی حازریدا دەسگیرکرابوو، ڕەوانەی بنکە تەندروستیەکانی باڵا دەست ترمان کردن.

ئۆتۆمبیٚلە لاندکرۆزەکە دەسکەوتی شۆڕشگیٚڕی فەرماندە عەودل کەوتبوو، عەودل ناوی ڕاستەقینەوی عەبدولکەریم بوو، فەرماندەی هیٚزی کەرکوك بوو، ئەو پلەیەی بەهۆی قارەمانیەتی شەهید ئەرپەی برایەوە پیٚ بەخشرابوو، ئەویش ناوی خۆی ئەحمەد بوو، ئەوان دوو برا بوون، لە منداڵیەوە دایکیان لە سۆز و خۆشەویستیا دوو ناوی تری لیٚ نابوون، ئەرپە بۆ ئەحمەد و بوغدە بۆ عەبدولکەریم ئەرپە بە مانای جۆ و بوغدە بە مانای گەنم.

ئازایەتی و جوامێری ئەرپە لە ڕیزی شۆڕش و خەباتی ئەیلولدا لە سەرتاسەری کوردستان دەنگی دابووەوە مەلا مستەفا وەك یەکێ لە کوڕەکانی خۆشی دەویست لە ساڵەکانی بەر لە یانزەی ئازاری حەفتادا، بە ڕۆژی نیوەڕۆ دەهاتە ناو شاری کەرکوکەوە، بە تەنیا و یەك دمانچەی هەڵدەگرت، هەر کە دەگەیشتە بەری شۆریجە و ئیمام قاسم ئیتر پۆلیس و پیاوانی حکومەت هەموو ناوچەکانی بەری ڕۆژهەڵاتی شاریان لێ دەبووە شۆڕشگێر و بەهەڵەداوان دەچوونە ئەو بەری پرد و نزیك بەسەربازگەکان.

وەك باوکی ئەرپە بۆی گێرامەوە..

– ئەرپە ڕۆژی پێشتر تا ئێوارە لەناو شار مایەوە، چەندم هەوڵ دا نەگەڕایەوە بۆ دەرەوەی شار و دەیگوت:

– حەیف نیە کوڕی کورد لەسەگ و پشیلەی حکومەت بترسن؟..

شەویش هەر لە ماڵەوە نوست، بەرەبەیان هەڵساو بۆیکەمجار بوو بینیم ئەرپە نوێژی بەیانی کرد، پاشان جلەکانی توند و تۆڵ پۆشی و، دەمانچەکەی بەلای چەپدا کرد و چووە دەرەوە، ئەرپە ڕووی کردبووە سەرتاشخانەکە و لەسەر کورسی یەکەی بەردەم ئاوێنەکە دانیشتبوو کە دەلاك ڕیشی بۆ بتاشێ کەچی بێ ئاگا لە دەرەوە کە چەندین هێزی پۆلیس و سەرباز سەر دووکان و بازارەکان و قوتابخانە و کۆڵانەکانیان لێ گرتبوو، دەلاکیش، پەیتا پەیتا لاڕوومەتەکانی ئەرپەی کەفاوی دەکرد، بەرلەوەی دەس بۆ کوێزانەکە بەرێت ئاورێك بۆ دەرەوە دەداتەوە دەبینێ سەربازەکان بە ئاماژەی دەست پێی دەڵێن، خۆت لادە!..

دەلاکیش هەر ئەوەندەی بۆ ئەکرێ خۆی هەڵداتە ژێر کورسی یە درێژەکەی پاڵ دیوارەکە و هاوار بکا: ئەرپە کوژرای!!..

هەر چەندە ئەرپە دەمانچەکە لە کیف ڕائەکێشیٚ بەلاّم. .

ناگاتــە تەقــە و بــەدەیان و دەیــان ســەرباز و پــۆلیس بەتفــەنگ و ڕەشــاش دوکانەکەشــی پێــوە هــەنجن ئەکــەن و ئەرپــە شــەهید دەبێت.

عــەودل شــێخە و مــەلاهیمن دەگەیەنێتــە گونــدی کــچان، کەچــی هەروەك پێشبینیمان کردبوو قۆناخیٚ بەر لە گەیشتنی نـاو گونـد، مەلا گیان دەسپێریٚ و بەلاّم شێخە دەگاتـە جێگـای مەبەسـت و چارەسـەری پێویستی بۆ دەکریٚ و برینکەی سارێژ دەبێت.

پاش گەڕانـەوەی هێزەکانمـان، بـۆ ژەمـی نیوەڕۆیـەك لەگـەڵ عـەدە سوورا چووینە بارەگای هێزەکەی عەودل، پێش نـانی نیـوەڕۆ دوو لاوی هــاولاّتی لــە چەمــچەماڵەوە گەیــشتنە لامــان، ئــەوان داوای پەیوەنــدیان دەکرد بە شـۆڕش پـاش هەنـدیٚ پرسـیار و وەلاّم عـەودڵ ڕازی بـوو لای خــۆی بیانکــات بــە شۆڕشــگێڕ بــە مــەرجیٚ خێــزان و منداڵــەکانیان لــە چەمچەماڵەوە بهێنین بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاّتی شـۆڕش منیش ڕووم کردە لاوەکان ووتم:

باشە بەخێر بێن! بەلاّم چۆنەوا ئێـوە لـە چەمـچەماڵەوە تـا ئەگاتـە ئێرە بەسەر دەیان بارەگا و هێزی شۆڕشگێڕا تێپەربوون و پەیوەندیتان نــەکردووە لێــرە پەیوەنــدی ئەکــەن؟ خۆکەســیٚ نیــازی گەیــشتن بــە شۆڕشگێڕانی هەبیٚ لەگەڵ بینینی یەکەم شۆڕشـگێڕدا پەیوەنـدی دەکـا، ئێوەیەکی نەناسراو چۆن وا گەیشتنە ئێرە؟

هەندیٚ قسەیان بزرکاند و عەودل هەڵیدایە:

– دکتۆر واز لەو قسانە بێنە جاریٚ برسیمانە بانانیٚ بخۆین

تۆزیٚ خۆی بەلای دەرگاکەیا لارکردەوە و ڕووی کردە دەرەوە

– ئەریٚ سمکۆ گیان چیمان هەیە؟! برسیمانە برسی!
سمکۆ لە ژووری لای پشتەوە دەنگی لیٚوە هات:
– وەڵا کاك عەول گیان بۆ ئەم نیوەرۆیە خورماو رۆنمان کردووە بە هیٚلکەوە.
عەودل تۆزیٚ دەم و چاوی گرژ کرد و وتی:
– وەڵا بابە کابرای قەیتول لیٚرەش لیٚمان پەیا بوو.
ئەم رستەیەم بەلاوە سەیر بوو وتم:
–کابرای قەیتول مانای چی کاك عەودل؟
وتی:
–دکتۆر گیان من دوو بەشی هۆی هیٚنانی مۆڵگاو بارەگای خۆم لە ناوچەی قەیتول و ئۆمەرملەوە لە دەس خورما و ڕۆن هیٚنایەوە ئیٚرە.
+خورما و رۆن بۆچی؟
–ئەزانی بۆ؟.. بالە نوکەوە بۆت بگیٚرمەوە
خۆت ئەزانی ئیٚمە لە گەرمیان بارەگای جیٚگیرمان نەبوو، زیاتر بە گەڕان بەسەر گوندەکان و ژەمەکانیشمان بەسەر هاوولاتیاندا دابەش دەکرد، هەر ژەمە و لە گوندیٚك و لە ماڵیٚك بە گەیشتنی هەر گوندیٚك شۆڕشگیٚڕەکانم دەبردە بەر مزگەوتی دیٚ و دەمنارد بە دوای ئەنجومەنی گوندا و ئەویش بەپیٚ ی بەرنامە و خشتەی نۆبەتی ماڵان هەر ماڵە و دوو شۆڕشگیٚری بۆ ئەنارد و من و حەمەڕەشی جیٚگرم دەماینەوە و دەچووینە ماڵیٚك، بەلاّم زیاتر ماڵی ئەنجومەنەکان، کەچی لە ماوەی ئەو چەند مانگەیا لە خورما و ڕۆن و نیٚرکەپیاز و بەولاوە هیچی تر نەبوو بۆ نەهامەتی دوو ددانی کاکیلەم کلۆربووە و دوژمنی سەرەکی دانەکانم شیرینی یە، نەمدەزانی ئەم خورمایە چۆن ئەم هەموو

گوندەیان داگیر کردووە سەرم دەکرد بەهەرماڵێکا خورما و ڕۆنە و خورما و ڕۆن!! کەچی ڕۆژێکیان لە گوندی قەیتول لەسەر سەکۆی ژێر درەختی مزگەوتەکە ڕاکشابووم لەو پەڕی گوندەوە گوێم لە دەنگێکی دوور بوو هاواری دەکرد، خورما.. خورما.. خورما.. شۆڕشگێڕێکم نارد بەڕاکردن بچێ بە شوێن کابرای خورما فرۆشا، ئەوەندەی نەبرد کابرا بە خۆی و بار و بارگیرەوە گەیشتە لام.

+ سەلاموعەلەیکوم.

– ئەی عەلەیکە سەلام، ماندوو نەبی!

+ خوا دەوامی عومرت بدا بوم وەسیاقەت

– ئەمە چییە بەسەرپشتی ئەم ولاخەوە خالۆ!

+ ئەیە خورماس برای شیرین چەند کیلوەت گەرەك

– چەن کیلۆم گەرەك؟ نەوەڵا تۆ چەن شەقت گەرەك، هەی میکرۆب !! ئەمە تۆی، تەبشیری خورما ئەکەی لەم گوندانە؟ ماڵ نەماوە پڕت نەکردبێ لە خورما؟ گوێ بگرە وەڵڵا وەڵڵا جارێکی تر لە سنووری ئەم گوندانە خورما بفرۆشی، بتگرم پشتت لە زگت نەرمتر ئەکەم بە شەق.

کابرا واقی ورما نەی ئەزانی چی بڵێت.. رووی کردە شۆڕشگێڕەکان و

+ ئەمە یڕژی عارەقی خواردوە سۆ

– عارەقم خواردوەتەوە، یا خورماکەی تۆ عارەقە؟ سەرتاسەری ئەم گەرمیانەت پڕکردووە لە خورما سەرئەکەم بەهەر ماڵێکا خورماو ڕۆنم بۆ ئەکەن، منیش دانم ژان ئەکا و خورمام پێ ناخورێ، خۆتۆ منت لەبرسا کوشت گوێ بگرە، دوایی نەڵێی پێت نەگوتم، ولاخەکەت

ڕاکێشه و بڕۆ، هەتا من لەم گوندانەی ئەم ناوچەیەم نامەویٚ خورمای تۆ ببینم، بڕۆ ناوچەیەکی تربیفرۆشە، خوا ماڵت وێران کا وا منت لە برسا وێران کردووە.

لە ڕاستییا پیٚ دەچیٚ عەودل هەر بۆ قۆشمە و پێکەنین سەری خستبێتە سەر ئەو کابرا خورما فرۆشە، ئەگەرنا دەیتوانی لەهەر ماڵێك داوای نان و ماست و دۆیەك بکا و خورما نەخوات.

پاش ماوەیەك بە فەرمانێکی خێرا دووبارە عەودل بارەگای گواستەوە بەرەو گەرمیان لە گوندی ئۆمەرمل بارەگای دامەزراند، هەردوو هاولاتی یە بەناو شۆڕشگێڕەکەشی هەمیشە لەگەڵدا بوو، کەچی پاش مانگێك، ڕۆژیٚ بۆ سەردانی بارەگای گشتی هێزی شۆڕشگێڕەکان لە قۆپی جافەران خۆی و حەمەڕەش و هەردوو شۆڕشگێڕی نویٚ سواری ئۆتۆمۆبێلە لاندکرۆزەکە دەبن کە عەودل بۆخۆی لیٚ ی دەخوڕی و حەمەڕەش لە تەنیشتیەوە هەردوو شۆڕشگێڕە سیخوڕەکەش لە پشتەوە.. کەچی نیازی دوو سیخوڕەکە نیازێکی تربوو، نەك گەیشتن بە بارەگای گشتی، کاتیٚ دەگەنە ئاستی گوندی سەرقەلا و سەر ڕێگا سوورەگڵە بەرز و نزمەکەی نزیك شەقامی گشتی سەنگاو بۆ گوندی کچان.

پێدەچوو هەردوو هاولاتی خۆفرۆش پێش بەریٚ کەوتن میلی تفەنگەکانیان ڕاکێشا بیٚ و ئامادەی تەقە بووبن، هەردووکیان تفەنگەکانیان ڕووکردبووە پێشەوە، یەکیان بۆ عەودل، یەکێکیان بۆ حەمەڕەش هەردوو پێکەوە سەرو ڕەگباریٚ فیشەك دەنێنە کەللەسەری عەودل و حەمەڕەشەوە، لەگەڵ تەقەی تفەنگەکانا عەودل ڕووی بۆ دواوە وەرگێڕابوو، بۆیە لایەکی ڕووخساری یەکسەرە پێوە نەمابوو زۆر بیٚ

ویژدانانه و بێ بەزەییانه شەهیدیان دەکەن و لاشەکانیان فڕێ ئەدەنە خوار و بەهەمان ئۆتۆمۆبێل بەرەو بازگەکەی سەنگاو بۆی دەرئەچن، کاتێ شۆڕشگێڕەکان دەگەنە سەرماڵی بکوژانی عەودل لە ئۆمەرمل ماڵ چۆڵ و دەرگاکانیان لەسەر پشت کرابووەوە کەسی تیا نەبوو، خەڵکەکە دەیانگوت:

ئێمە لە دوێنێ ئێوارەوە منداڵەکانی ئەوانمان نەبینیوە، دیار بوو ئەم کارە بەرنامەڕێژییەکی چاکی بۆ کرابوو. ئەمە لەلایەن شۆڕشگێڕەکانەوە شتێکی نەزانراو نەبوو، ئێمە زۆرمان بە عەودل گوتبوو ڕاگرتنی ئەم هاووڵاتیە بە شۆڕشگێڕ کارێکی ژیرانە نی یە تۆ دەیکەیت، بەڵام کەس نەیتوانی بیر و باوەڕە سەقەتەکەی عەودل بگۆڕێ تا ئاوا سەری خۆی دانا بە دەستی دوو خۆ فرۆشی چڵکن.

## -١٠-

سەر لە بەیانییەکی ئارام بوو، بە پشتی پەنجەکانی دەستم ئاونگی سەرپەڕی گوڵە نێرگسەکانم دەپرژاند، هاڕەی پانزە فرۆکەی جەنگی، جوانی گوڵەکانیان لە بیر بردمەوە، ئەوان لە کەرکوکەوە بەسەر ئاسمانی قەراخا ڕوویان کردە دەشتی شارەزوور و بناری سورێن، ئەوەندی پێ نەچوو، ناڵەی بۆمبا و هاڕەی فرۆکەکان هەڵەبجە و بناری سورێنیان شێواند.

دووربینەکەم لە سمکۆ وەرگرت و ڕووم کردە ڕووداوەکە، چی ببینم؟

تۆ پەڵ تۆپەڵ دووکەڵی خەستی سپی و مەیلە و زەردم دەدی، بەرشاشەی دووربینەکەم وەکو بەرشاشەی سینەما تەنەکەکەی قالەی برام نەبوو، کە منداڵان لە بەردەمیا یەکتریان هەڵدەشێلا و نازە و پۆلیسم تیا دەبینی، خۆزگە یەکتر هەڵشێلانی شۆڕشگێڕ و سەربازی حکومەت بوایە، نەك ئەم فلیمە تراژیدیە زیندووە، ئەم فیلمە فیلمی کیمیا بارانی هەڵەبجە یە، فیلمی قەلاچۆکردنی گەلێکە، فلیمی بڕینی هەزاران زمانە، فلیمی زیندە بە چاڵ کردنی حەشاماتێکە، تا دەمە و ئێوارە هەوڵی وەرگرتنی زانیاریماندا سەبارەت بەو هێرشە نا مرۆڤانەیە، کەچی شۆڕشگێرەکانی ئەو ناوچەیە ئەوەندە سەرقاڵ بوون،

هیچ زانیاری یەکمان وەرنەگرت، تەنها ئەوەندە نەبێ کە بە بێتەل دەیانگوت:

– شەهید و بریندار لە ژماردن نایەت، پێکراوەکانیش هیوای چاك بوونەوەیان نییە، چەند ڕۆژێ لەوەدوا زانیاریمان پێ گەیشت کە حکومەت نیازی هێرشێکی بەربلاوی بەدەستەوەیە بۆ ناوچەکانی قەراخ و گەرمیان.

هەر ئەو شەوە ئەو گوندانەی هەواڵیان پێ گەیشت گوندیان چۆڵ کرد و هەندێك بۆ کەلوەز و ئەشکەوت و کەلەبەری چیاکان و هەندێکیان بەرەو شار و شارۆچکە و کۆمەڵگەکان ملیان نا.

هێزەکانمان بە زنجیرە چیاکەی پشت دەربەند فەقەرەیا دابەشبوون، ئێمەش هێزێکی بیست کەسی لەگەڵ سەرلەشکردا لە گوندە چۆڵەکەی (فەقیرە) لە ماڵێکی پڕ کەرەستە و بێ خاوەن ماینەوە، هەندێ لە شۆرشگێرەکان چوونە سەرکەل و چاودێری دەشتی شارەزووریان دەکرد من و فاتیح گەورەدێی و مام هێرش و شۆرش هەندێ هەویرمان شێلا تا بیکەینە نانە ساجی و لەسەنگەری شەڕدا پێمان بێت هەموو سەرکەوتین بۆ سەرکەل، تانجییەکی ناودێ لەگەڵ مندا کەوتە ڕێ چەند جارێ دەرم کرد، کەچی لێم جیا نەئەبووەوە، بە زۆری زۆرداری منی کردبوو بە خاوەنی خۆی، گوێچکە نانە ساجی یەکم بۆ هەڵدا، بۆنێکی پێوەکرد و نەیخوارد، دیسان کەوتە هاوشانم، ئەی گوایە ئەم تانجییە چیدەوێ؟ تۆ بڵێی هەستی بە نیگەرانی و ناوەوەی دڵ و دەروونی ئێمە کردبێ و حەز بکا لە نزیکەوە ڕوودا و ببینێ؟!

کە گەیشتینە سەرکەل و دەشتی شارەزوورمان لێوە دەرکەوت هەروەها دەرچوو، تانجییە پشت بۆرەکە وەکو مرۆڤێك هەستی بە هەموو شتێك کردبوو، کرداری ئەو تانجی یەلە جیهانی شەڕ و پێشهات دایبریبووم، هەردوو دەستی خستە سەر تاشەبەردێك و کەمێ سەری هەڵبڕی و تەماشای تەواوی پانتایی شارەزووری دەکرد.

جار جارە ئاوڕێکی لەمن دەدایەوە، بەزمانی بێ زمان قسەی لەگەڵ دەکردم دەیگوت:

ئەمە کارێکی گەوجانەیە ئێوە بەم تفەنگەوە ڕوو بەڕووی هێزێکی وا دەوەستن.

بە ئاشکرا پێیدەگوتم بە هاوەڵە شۆڕشگێرەکانت بڵێ با ئەم کارە نەکەن.

دواجار ڕووی بەرەو دواوە وەرگێڕا و چەند جارێ ڕووی دەکردە من و ڕووی بەرەو دواوە وەردەگێرا و تەماشای هێزە سەربازییەکەی دەکرد.

ئینجا بەهەموو هێز و راکردنە تانجییانەکەی خۆی بەرەو دوا رووی کردەوە گوندی نەوتی و دۆڵی شیوقازی و قولایی ناوچەی قەرەداخ و بۆی دەرچوو. ئەو لە کێشە ڕامیاری یەکان و هۆیەکانی نەدەگەیشت و تێ نەدەفکری بە هەر حاڵ ئامۆژگاریەکی پیرۆزی پێشکەش کرد. ئازار و ژان و ڕاونان و کوشتن، ئاژەڵەکانیشی فێری خۆپاراستن و بەرگری کردبوو.

زەردەپەڕ لە ئاسۆگای لوتکەکانی سورێنەوە تێکەڵ بە تەم و مژی دەشتی شارەزوور دەبوو، شەماڵ هەواڵی کارەساتی پێ بوو، نەسیم سەمتووری ژانی لێدەدا و گۆشەی کەلێنی کێوەکان بە ڕەنگێکی سوور

دەیانڕوانی و لە گۆمێکی خوێن دەچوون، گوندە چۆڵەکان بەسەر پۆشێکی ڕەشەوە دۆش داما بوون، گیاندار و بێ گیان چاوەڕوانی کارەساتێکی سەخت بوون، هاڕە و جموجۆڵی تانکەکان لە دوورەوە دەبیستران، هەر ئەمشەوی ڕابردووش لە کاتی دروست کردنی نانە ساجی یەکاندا گوێم لە چەند ڕەتڵێ مووشەك بارانی گوندەکانی پشتەوە بوو لە ناوچەی قەراخ، زەمینیان دەکوتا و گوێ یان کپ دەکرد و شوشەی بۆفیە جوانەکەی ماڵە بێ خاوەنەکەیان دەلەرزاند، دەشمزانی ئەو ڕەتڵە مووشەکانە تەقینەوەی ئاسایی نین، دەنگێکی کەمتر و سامێکی زۆرتریان هەبوو، دڵم لای کۆرپە قژ زەردەکانی دوروتوێی جێگای نوستن بوو کە بێ ئاگا لە جیهانی وڵاتەکەیان پرخەی خەویان دەهات.

هێشتا هەر ڕۆژ هەڵنەهاتبوو، واپێ دەچوو ڕۆژیش لە ڕۆژێکی وا یاخی بوو بێت و هەڵاتنی پێخۆش نەبێت، زەنگی جەنگ بە خومپارەیەکی دووکەڵ سپی لێدرا کە لەلای چەپی ئێمە کەوتە زەوی و شەماڵ دووکەڵەکەی لابەلا بەرەو ئێمە ئەهێنا، تەنها چەند (بی، کەی، سی)یەك و چەند ئاربیجیەکی ئێمە لە گوندەکانی شەمەوێلەکە و دەربەند فەقەرە دامەزرابوون ئێمەش لەسەرچیا و مەترە لۆزەکەیش تەنها چەند سەد فیشەکێکی لاوەبوو، عەزەشورتە هەردوو دەسکی مەترەلۆزەکەی گرتبوو و چاوەڕوانی فەرمانبوو، دوا بە دوای خومپارە سپییەکە رەهێڵەی تۆپباران تەپڵی سەری چیای داکوتا، تۆپە دوور هاوێژەکان پشتەوەی ئێمە و چیاکەیان دەکوڵاند تۆپ و ڕەگباری حەفتا و شەش تانك، بەرسنگی چیا و گوندەکانی بنار و پێشەوەیان دادەبێژا سەرتاپای هەردوو دیوو تەوقەسەری چیا کە ئێمەی لەسەر بووین ببو

به ئاگر و دوکەڵ و تیسکەی پارچە تۆپ و گیزەی وگوللە و گڤەی وردە بەردی تاشەکان، بۆنی دوکەڵ و باروتی سووتاو قورگی شۆڕشگێڕەکانی وشک دەکرد تانکەکان تۆپەڵ تۆپەڵ سەربازیان لە پشتی خۆیان دەشاردەوە و دەهاتنە پێش، تا دەگەیشتنە قۆناخی ڕێگای، بڕی فیشەکی تفەنگێك، سەربازەکانیان جێدەهێشت و خۆشیان پاشە و پاش دەکشانەوە، بەڵام هێشتا شۆڕشگێڕەکان خۆیان ئاشکرا نەکردبوو، ئەوان لە خوارەوە هەر پۆلە و ئامێرێکی بێتەلیان لابوو چاوەڕوانی فەرمانی بەرپرسە شۆڕشگێڕەکانی خۆیان دەکرد تاکۆمەڵێکی بێ شومار لەسەربازەکان هاتنە بەر دەستی شۆڕشگێڕان. وردە وردە بۆمباران هێمن بووەوە، چونکە هێزی پیادەرەوی سەربازی لە شوێنە بۆمبارانکراوەکان نزیك دەبوونەوە. بە فرمانی سەرلەشکر تێکڕای شۆڕشگێڕان هاتنە دەست

چەخماخەی دەمی خەنجەر و شمشێر پرشنگی دا و گەیشتە کەهکەشانی فەلەك. هێزە پیادەڕەوەکە وەك گەڵای دار دەڕمان، پانتاییەکی بێ سەنگەر بوو، ئەوان لە هاتنە پێشدا لە پێشەوە پێدەکران، لە دانیشتنا هەروا لە هەڵاتندا لە پشتەوە پێدەکران، کاتێ دەرکەوت بەرەنگار بوونەوە هەیە دووبارە تۆپ و تانکەکان کەوتنە کار، بنار و ناوەندی چیا، هیچ بەردێك نەما چەندین فیشەکی بەرنەکەوتبێ، بەڵام گابەردەکان قەڵخانێکی پۆڵاین بوون بۆ شۆڕشگێڕەکان، کەچی کۆپتەرە کاتیۆشادارەکان پەیدا بوون و بە نۆرە دەکەوتنە کێڵانی چیاکە، هەر تۆپ و خومپارەیەك دەکەوتە زەوی، بە هەزاران پارچە و هەزاران وردە بەردیشی دەپرژاند. هێرشی دوژمن بەردەوام و یەك لە دوای یەك بوو، تاکە مەترەڵۆزەکەی عەزەشورتە، بریسکەی لە

سەرپشتی تانکەکان دەکردەوە، مام هێرش پەیتا پەیتا مووشەکی (ئار، بی، جی) بۆ کۆپتەرەکان رەوانەی ئاسمان دەکرد.

کوژراوی دوژمن ئەوەی کەبەچاو دەبینرا پتر لە سیٚ سەد لاشە بوو، وردە وردە فیشەکمان دەهاتە کزی، هیچ هێز و مۆڵگایەکی یەدەکیش نەبوو تا بێت بە دەنگی شۆڕشگێڕەکانەوە یا فیشەکمان بۆ بنێریٚ.

لەشکری دوژمنیش لەشکری دەوڵەتێك بوو، لە تەقەمەنی و سەرباز و خۆراکدا لەبن نەدەهات، سەرباز وەکو هەنگ لە ئێمە و چیاکە ئاپۆرەیان کردبوو.

بەرەبەیانی ڕۆژی دوایی هێرشی دوژمن بە شێوەیەکی بەربڵاو دەستی پیٚ کرد لە بەیانیەوە تا پاش نیوەرۆ دوانزە هێرشی لەسەریەك کرا.

سەربازێك دەکەوت و ئەوی تر بەسەریا بازی ئەدا و ئەهاتە پێش، نازانم بۆ ئەوەندە بە دڵ و داو لە دژی ئێمە دەجەنگان، زۆربەی سەربازەکان جل و بەرگی بەڵەك و کلاوی زریپۆش و تفەنگی بیٚ قۆناخیان پێبوو، هەمووشیان ڕەش پێست بوون، دەمزانی ئەمانە سەربازی وڵاتی ئێراق نین، بەڵام نەمدەزانی لە چ وڵاتێکەوە هاتوون، هەر چۆنێك بیٚ لە کاتی پێکرانیان هاوار و بانگی یەکتر کردنیان دەمزانی کە عارەبن، ئیتر نازانم ئەم عارەبی یە و ئەم ڕەش پێستانە مانای چی؟

بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەم عارەبانە و عارەبی سپی پێست کامیان ڕاستەقینەی ڕەگەزی عارەبن، بەڵام بە گوێرەی کردەوەی حازری یان، پێموابوو کە هەر ئەمانە ڕاستەقینەی ڕەگەزەکەن، بیر و هۆشم لای

مەیدانی جەنگەکە نەماو کەوتمە خەیاڵی هێرشەکانی عەرەب بۆ سەرکورد لەسەرەتاکانی بڵاوکردنەوە و گەیاندنی پەیامی ئیسلامیدا.

بە ئاشکرا دەمزانی کە گەلی کورد، لەگەڵ گەیشتنی یەکەم نامەی ئیسلامدا لەلایەن عارەبەوە بۆ ئاینی ئیسلام و ڕێبازی خودای تاقانە و پێغەمبەرەکەی، ڕەزامەندی دەربڕیوە، چونکە وڵاتی کورد و کێوەکانی شایەتی یەکە یەکەی پێغەمبەرەکانی بەر لە ئیسلام بووە و تاقانە پەرست بووە، ئەگەر نا کێ دەتوانێ بڵێ یەکەم مرۆڤ و یەکەم پێغەمبەر لەسەر ئەم زەوی یە ئادەم نەبووە؟ ! کێ دەتوانێ بڵێ شیث و یونس نەوەی ڕاستە وخۆی ئادەم نین؟ کە ئێستا گۆڕەکانیان لەسەر خاکی کوردە لە موسل کێ دەتوانێ بونی حەزرەتی نوح لە کوردستان و بوونی پارچە کەشتی یەکەی لەسەر چیای جوودی لە کوردستان نەسەلمێنێ؟ کێ دەتوانێ بوونی گۆڕی (دانیال) پێغەمبەر لەسەر قەلاّی کەرکوک نەسەلمێنێ کە دەیان جار لەگەڵ دایە دەچووینە زیارەتی، کێ دەتوانێ بوونی حەزرەتی ئیبراهیم لە کوردستان نەسەلمێنێ کە ڕەچەڵەکی پێغەمبەر ئەگەڕێتەوە سەر ئەو؟!

بۆیە ئەوەی زیاتر سەری منی پێ سووڕ مابوو، جگە لە ئەولیاکانی باو باپیرانی خۆمان. ئەو هەموو گۆڕە و شەخسە پەرۆینەی بناری چیای سەگرمە و بناری هەورامان و عەکاشە و ئۆمەرمەندان و چەندین و چەندینی تر بوو، ئەمانە چۆن و کەی و بۆ گەیشتوونەتە سەر خاکی کورد و لێرە ئەسپەردە کراون، ئەمانە هەمیشە پرسیارێکی بێ وەڵام بوون لای من و ناچار بووم بۆ خۆم وەڵامێکی پڕپێستیان بۆ بدۆزمەوە.

بەبۆچوونی خۆم دەمگووت:

نەخێر ئەمانە بۆ گەیاندنی هیچ جۆرە ئایینێك نەگەیشتوونەتە ئێرە، ئەمانە هەبێت و نەبێ سودیان لە ئیسلام و ئاینەکەی وەرگرتووە و بەهەلیان زانیوە و هەروەکو ئێستا لە ژێر پەردەی ئیسلامەوە هێرشیان هێناوەتە سەر ناوچەکانی کوردستان، بۆ کوشت و بڕو ڕاوەدونان و فڕان فڕان و تالآنی و دەستدرێژی بۆ سەر ناموسی ئافرەتی کورد، کوردیش ئەوەی لێ قبوولْ نەکردوون و بەسزای خۆیان گەیشتوون وهەر لەوێش ئەسپەردەکراون، ئیتر لەوەولا مێژوو کارەساتەکەی کۆن کردووە و پاش تۆخ بوونەوەی ئیسلامەتی لە کوردستان، هۆی مردنەکانیان بزر بووە و لەبیرچووەتەوە. تەنها شتێك کە وننەبووە غەریبایەتی و نامۆیی خاوەنی ئەم گۆڕانە بووە. خەڵکیش بۆ ئەوەی خوا و ئیسلام لێیان ڕازی بن، کەوتونەتە خزمەت کردن و کۆکردنەوەی کەڵەکە بەرد لە دەوریان و ناسراون بە ئەولیا و پیاوانی خودا، پاشانیش نەخۆش و بادار و شێت و هار و کوێر و نەزۆکیان بردونەتە سەر تا ئێستا.

هاتمەوە مەیدانی جەنگ و هێرشەکەم لە پێستی هەمان هێرشی رابردووی مێژینەدا دەبینی.

لە گەرمەی هێرشی ئەوان و بەرەنگاربوونەوەی ئێمەدا توڕەتر و توڕەتر دەبووم بەلآم کە زۆر هات قەوالە بەتالە، تا دەهات هێرشی دوژمن توندتر و بەهێزتر دەبوو تەقەمەنی ئێمەش بەرەوکزی دەڕۆیشت و لە براندا بوو، بەرەنگاربوونەوە گەیشتە بەکارهێنانی دەمانچە و نارنجۆك، دەرفەت نەما هێزەکانی شۆڕش ناچار کران بە پاشەکشێ، سێ شەهید و کۆمەڵێ بریندارمان ڕەوانە کردەوە و هێزەکانمان کۆکردەوە و کەوتینەرێ بەرەو مۆڵگاکانی خۆمان لە قوپی جافەران بە

شیوقازیبیا شۆڕ بووینەوە بەرەو گوندی نەوتی و تافان، کە گەیشتینە جافەران ترسی سەگە هەوشارەکەی ماڵی مام عەلی دوکاندارم لێ نیشت، سەگێکی تیسکنی چەپۆڵە ئەستووری ناحەزیان هەبوو، نازانم بۆ ئەوەندە ڕقی لە زەلامی چەکدار بوو، هەرکە چاوی بە چەکدارێك بکەوتایە ئیتر مووەکانی لەشی وەك شوژن ڕەپ دەبوون و چاوەکانی دەبوون بە گلۆم خوێن، لە پێستی سەگ دەرئەچوو و ئەچووە پێستی شێر و پڵنگەوە هەڵئەسایە سەر هەردوو پێ و کەف لە لغاوەی دەرئەپەرێ.

کە تەواو کەوتینە ناو گوند جیهانێکی ترم دەدی، چۆلەکەی مردارەوە بوو لەبن دیوارەکان لە گویسوانەکانەوە کەوتبوونە خوارەوە، کۆتر و مریشك و مەڕ و ماڵات و ڕەشەوڵاخ تێکڕا مردار ببونەوە، ناو بەناو موشەکی کاتیۆشای گەورە نوکەکانیان لە زەمین چەقیبوو پاشەوەیان هەڵتلێشا بوو، لە دوورەوە سەگەکەی ماڵی مام عەلیم بینی، تەنها ئەو زیندوو بوو، خەمی ئەم دیمەنانە لەلایەك و ترسی سەگە دڕەکە لەلایەك، کاتێ نزیك بوومەوە سەگەکە وەکو جاران ئامبازم نەبووە و ڕووشی تێ نەکردم، تەواو چوومە بەردەمی، کەچی ئەو بۆیەك لاپەیڕوانی و ئاو لە چاوەکانی دەهاتە خوار هەناسە بڕکێ یەکی توندی بوو، دەتگوت ئێستا لە ڕاو هاتوەتەوە. تەنها تۆزێ دەیمڕاند بەڵام نەك مڕاندنەکەی چەند ڕۆژ لەمەوبەر، لە مڕە نەدەچوو، لە گریانێکی بەکوڵ دەچوو، تێگەیشتم کە چاوەکانی زەق زەق دەڕوانن و نابینێت، هەستم بە سوتانەوەی چاوە زەردەکانی دەکرد ئاگام لە ئازاری ناو جەرگ و سیپەلاکی بوو پەلامار و هەڵمەت بردن و ئەمبەر و ئەوبەری چەند ڕۆژێ

بەر لە ئێستایم هاتە یاد. حەزم دەکرد فیشەکێکی میهرەبانی بنێم بە تەوێڵیەوە و لەو کوڵەمەرگیە ڕزگاریکەم، بەڵام دەستم تێنەچوو.

هەر ئەوەندەم بۆکرا بە توندی چاو بنوقێنم و بەلای چەپا داگەڕێم و جێی بێڵم ئەو حەقی بوو حەز لە چەك نەکات چونکە ئەیزانی چەك ئەمەی لە دوایە، بەڵام کەس بە گوێ ی ئەوی نەدەکرد.

لەوپەڕی گوندەوە بارەگای شۆڕشگێڕەکان بوو، ئەوان لە کاتی بۆمبارانی موشەکە ژەهراوییەکانا هەڵاتبوون و نەپەرژابوون بەکردنەوەی دەرگای زیندانی دیلە بەندیەکانا و لەگەڵ خۆیاندا بیان بەن، دەرگای زیندانەکەمان شکان شەش دیلی تیا بوو، بەڵام هەوای ژەهراوی نەچووبووە ناو زیندانەکەوە خۆشبەختانە هیچیان لێ نەهاتبوو.

هەردو هەڵەت و بنارەکان پڕ ببوون لە هاولاتیانی گوندنشینی ناوچەکە، زۆربەیان پێکراوی هەوای ژەهراوی بوون، هەندێ لە شۆڕشگێڕەکانی ئێمەش پێکرابوون سیروان چاوەکانی نەیدەبینی و پەیتا پەیتا دەڕشایەوە، ئەو لاوێکی موزەردی چاو شینی ڕوو خۆشی مندالی شۆریجەی کەرکوك بوو یەکێك بوو لەو شۆڕشگێرانەی لە بارەگاکەی جافەرانا مابوونەوە، زۆربەی پێکراوەکان چاویان لە دەس دابوو بیبلەی ناوەڕاستی گلێنەی چاوەکانیان زۆر بچووك ببووەوە و بە ئاستەم دەبینرا، پەیتا پەیتا دەرزی ئەترۆپینم بۆ دەکردن، بۆ چاوەکانیشیان پێویستی بە(تنۆك تکێنی) ئەترۆپین دەکرد، بەڵام نەبوو، ناچار بووم ئەمپولێکی ئەترۆپین لەگەڵ ئاوی دەرزی لێدان تێکەڵ بکەم و خاوی بکەمەوە و بە تنۆك بیکەمە چاوەکانیانەوە هەر چەند ئەوە لە بەرنامەی پزیشکیدا نەبوو، بەڵام ناچاری پەنات بۆ هەموو

کارێـك پــێ دەبـا تـا وردە وردە چـاوەکانیان کەوتـەوە بیـنین، هـەموو پێکراوەکانمان ڕەوانەی ناوچەکانی دوورە شەڕکرد.
پاش نیوەڕۆ لەگـەڵ عـەدە سـوورا کەوتینـەڕێ بـۆ گونـدی قـازان قایـە، بـۆ هـەواڵ پرسـینی هەنـدێ لـە خزمـەکانی عـەدە، چـونکە ئـەم بەیانییە لە کاتی هێرشەکانا فرۆکەکان بۆمبایـەکی گـەورەیان سرەواندە نـاو گونـدا زۆربـەی ماڵـەکان سـووتان، بـە گونـدی چووچـانیەکانا سەرکەوتین و خۆمان گەیاندە قازان قایە هێشتا تاك و تەرا خەڵك لە ناو گونـد مابوونـەوە، لـە پـشت مزگـەوت کزۆڵـەیان کردبـوو یـەکێ لـە گوندنشینەکان بازێکی گەورەی لە باوەش گرتبوو، کۆڕەکەیان سەبارەت بە باز و ڕەسەنایەتی ئەم جۆرە بازانە دەدوا، یەکێکیان کە ئەو پەڕی گرتبوو هەڵیدایە و وتی:
– ئێـوە هیـچتان هیـچی لێ نـازانن ئێـستا ئـەنێرین بـە شـوێن گوربازییا با ئەو بێت تەماشا بکا ئەو لە هەمووجمان شارەزاترە.
ئەوەندەی نەبرد گوربازی گەیشتەجێ، کابرایەکی بەساڵا چووی ڕەقەڵە، ڕەشتاڵە و باڵا بەرز، جامانەکەی بە تێکـەڵ و پێکـەڵی لـە سـەری ئاڵاند بوو، پاڵتۆیەکی دابوو بەسەر شانیا، هەر لە دوورەوە دەستی بۆ بازەکە درێژکرد و لە دەستی کابرای وەرگرت، کابراش وتی:
– پێویست ناکا کەس هیچ بڵێ ئێستا گوربازی خۆی ئەم بـازە هەڵئەسنگێنێ و پێمان ئەڵێ:
گوربازی زۆربەی ددانەکانی کێشا بوو، لای سەرەوە چوار پێنج دانێـك و لای خـوارەوە تـەنها یـەك دانـی پێـشەوەی مـابوو، پـووکی ددانـەکانی خورابوونـەوە ددانـەکانی بـە درێـژی وەکـو سـنگ دەرکـەوتبوون و لـە نیـوە بـەرەو خـوار ڕەش و ژەنگـاوی بـوون، قـوڵی

پاڵتۆکـەی ڕاکێشایە سـەری دەسـتی و بازەکـەی لەسـەر ڕاگـرت، دەیڕوانییە بازەکە و کەوتە وەسف کردنی، باسی لە ڕەوشت و گـورج و گۆڵی و چۆنیەتی زاوزێ و خێرایـی بازدەکرد بازەکـەش بە چاوە خڕە وردبینەکەی دەیڕوانییە ئەم لا و ئەولا و سەر وسیمای گوربازی یا، لە پڕ هەندەی چاوتروکانێك دەنوکێکی وەشاندە ناو دەمی گوبازیا و تاکە دانەکەی خوارەوەی دەرهێنا، گوربازی بازەی فرێ دایە زەوی و دەستی گرت بە دەمیەوە و کەوتـە ئاخ و ئۆف خوێن لە بەینی پەنجەکانیـەوە دەچۆڕا تاکە دانەکەی گوربازی قووت درا، کۆڕی پشت مزگەوت کردیان بە پێکەنین و هەرا ناوبەناو دەیانگوت :

– ئەشەد و بیلا وەسفەکانی گوربازی تەواوە، باز گـورج و گۆڵە. باز خێرایە باز ئازایە، منیش لە دڵی خۆمدا ئەمگوت:

– بەخوا چاکت لێ نەزانی گوربازی، دەبخۆ دەی گیانت دەرچێ، بەڕیشی سپییەوە ئەقڵی خۆت دایە دەس ئـەم گـەنج و تواڵە، هەر ئەو شەوە گەڕاینەوە قۆپی جافەران.

بەرەبەیان بـە دەسـتی خۆمـان کەوتینـە سـوتاندنی بارەگاکـانی خۆمـان و بـە جێمانهێـشت و هەڵگـڕاین بـە چـیای سـەگرمەدا بـەرەو گوندەکانی مەسـۆیی سەروو خواروو، بنـار گل، شـۆڕبووینەوە، هـەر چەند دەمـانزانی هێرشـەکانی گـەرمیانیش هیـچی لـەوەی قـەراخ کـەمتر نییە، بەڵام چار نەبوو هەر نەبێ بۆ ئەوەی پشویەك بدەین و بیرێکی تری لێ بکەینـەوە، پاش ئـەوەی لـەو چـەند ڕۆژەیـا چـەند جار ڕوو بـەڕووی هێرشەکانی دوژمن بووینەوە لەوێش، بڕیارماندا بە شاراوەیی، شەوانە بگەڕێینـەوە ناوچـەی قـەراخ و لـەوێوە دەربـازبین هێـشتا گونـدەکانی گەرمیان تاکە تاکە ماڵ و هاوڵاتیان تیا مابوو.

شەمسەدین لاوێکی خەڵکی باڵەکایەتی و بێتەڵ بارەگای هێزەکەمان بوو، کەل و پەلی پێویستی بێتەلی و ئامێرە ڕاکاڵەکەی بەسەر پشتی ولاخێکەوە دەگێڕا، چەند ڕۆژێ بوو شەمسەدین تامەزرۆی خواردنی گۆشتی مریشك بوو، مریشکێکی لە ماڵێك کڕی و سەری بڕی و داوای لە ئافرەتی ماڵەکە کرد بۆمان لێ نێت، ئافرەتەکە هێشتا خەریکی ئاوەڕووتکردنی مریشکەکە بوو بڕیاردرا بە پەلە خۆمان کۆکەینەوە، بەڕێ کەوتین و مریشکەکە بەجێ ما، چوینە گوندی مەسۆیی بەرگەچ لەوێ مریشکێکی تری کڕی، ئەمجارەش مریشك چاك کرا و خرایە سەر ئاگر هێشتا ئاوەکەی گەرم نەبووبوو دیسان کەوتینەڕێ، لە گوندێکی ترلاماندا بڕیاربوو ئەو ئێوارەیە لەوێ بمێنینەوە ئیتر شەمسەدین دڵنیا بوو لە مانەوەمان. سەرەو خوار چووە ماڵەکانی ئەوبەر بۆ کڕینی مریشکێکی تر، ئەوەندەی پێ نەچوو، وتیان:

لێرەش دەبێ بڕۆین و پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە بگەینە دۆڵە سەختەکانی قۆپییەکانی قەراخ، هاوارم لەشەمسەدین کرد بە پەلە بگاتەوە لامان چوونکە دەڕۆین شەمسەدین لە پشت ماڵەکانەوە دەرکەوت و خێرا گەڕایەوە کە ڵەشێرێکی سپی قەڵەوی کڕیبوو وتم:

+ ئەمەت بۆ کڕی؟

– بۆ

+ دەبوایە نەتکڕیایە چوونکە دەڕۆین!

– ئەی من چی لەم کەڵەشێرە بکەم؟!

+ وەڵا خۆت ئەزانی چی لێ ئەکەی بیکە.

ناچارکەڵەشێرەکەی بەلای پاشوڵی بارگیرەکەیا هەڵواسی و لەگەڵ کلکی بارگیرەکەیا هاتبووەخوار، کەوتینەڕێ کەم کەم تاریک داهات، شەوێکی بێدەنگ بوو ناوبەناو لە تانک و هێزە هێرش هێنەرەکانی دوژمن نزیک دەبوویەنەوە و بەلایانا تێدەپەرین، دەبوو کەس وتەی لێوە نەیەت، کەچی لەگەڵ هەڵتەك هەڵتەکی بارگیرەکەی شەمسەدینا کەڵەشێرەکە جوقەیەکی لێوە ئەهات دیاربوو دەنگی کەڵەشێرەکە گەیشتبووە هێزەکانی دوژمن، بۆیە تانکەکان چەند تۆپێکی کوێرانەیان بەملا و ئەولاماندا هاوێشت، منیش بۆ ئەوەی کەڵەشێرە سپی نەبێتە هۆی زیان پێگەیاندنمان چەقۆ قەڵەمبڕەکەم دەرهێناو سەری کەڵەشێرەکەم لێ کردەوە بێ ئەوەی شەمسەدین ئاگای لێ بێت گەیشتینە گوندی ڕەبات لە بنار چیای سەگرمە، ڕەبات دەستی هێزەکانی پێ گەیشتبو خەڵکەکەیان ڕاپێچ کردبوو زۆربەی خانوەکان روخابوون هێشتا چرە دووکەڵی گویسوانەکان بەرز دەبووەوە، بارەی کارژەلێك لە ناو گوندەوە لەگەڵ چیاکەیا دەنگی ئەدایەوە، بەتەنیا ئەو مابووەوە کە ڕەتڵی شۆڕشگێڕەکانی بینی بەهەڵە داوان بەرەولای ئێمە هات. گوندمان بەجێهێشت و کارە کۆرپە هەر بە دوامانەوە بوو، وەك یەکێ لە شۆڕشگێڕەکان لەڕیزی ڕەتلەکەیا رچە ڕێگاکەی گرتبوو، بەڵام نەیدەتوانی بەپێی شۆڕشگێڕەکان بگات و بەرێگادا بڕوات یەکەیەکە شۆڕشگێڕەکان دەکەوتنە پێشی و بەجێیان ئەهێشت، ئەو بە هۆی ئێمەوە گوندەوێرانەکەی بەجێهێشت و کەوتەڕێ چونکە لەو تەنیاییە و لە برسان و لە ترسا دەیباڕان هەستی بەڕووداو دەکرد ڕەنگە دایکیشی لەگەڵ خەڵك و ماڵاتەکەیا ڕاپێچ و ئەنفال کرابێ، ئەوبوو بە دواین کەس لە ڕەتڵەکەیا و بەجێما، دەستی کردەوە باقەباق، باقەکەی لە گریان

دەچوو نەیدەویست جێ بمێنێ و بێ سەرپەرشت بێ، کەسێ لە شۆرشگێرەکان گوێیان بەهاواری ئەو نەدا، چەند جارێك ئاوڕم لێ دایەوە، پێم ڕێگای دانەدەگرت بەجێی بهێڵم ئاخر من شۆڕشگێڕ بووم بۆ بەرگری کردن لەو خاك و خەڵك و سامان و ماڵاتەی کوردستان گەر بەرگریم لەو هەموو کارەساتەش پێ نەکرابێ وا ئەم کارژەلەیە داوای یارمەتی دەکات. گەڕامەوە و کردمە باوەشم، وەك گەشکە دارێك بەملاو بەولایا بۆنی دەکرد بە باخەڵما و داوای بەزەیی دەکرد، پاش ئەوەی ماندوویی دەرچوو، ئارەقەی لەشی سارد بووەوە وەك شۆڕەبی کەوتە لەرزین ئەو زۆری برسی بوو، یەخەی چۆخەکەمی دەجووی، لە گیرفانما چنگێ وردەنانم پێ بوو لە مستما ڕامگرت و کەوتە خواردنی من هەر ئەوەندە نانەم پێ بوو، بەلام زیاتر بەوم ڕەوا دەبینی، لەگەڵ شۆڕشگێڕەکانا بە نۆرە هەڵمان گرت، تا گەیشتینە مێگەلێکی بەجێماو لە تەختیەك کۆزەیان کردبوو ئەویشمان بەرەڵای ناو ئەوان کرد.

بەری ئاسمان روونـاك دەبـووەوە، شەمسەدین ئاوڕێکی لە پاشۆڵی بارگیرەکە دایەوە تا بزانێ بۆ دەنگی کەشێرەکەی نایەت، کەڵەشێرە سپی بەسەرگەڵ و گیپاڵی خوێناوی و وشك هەڵاتوی بارگیرەکەوە، رەق ببوو:

بەلوولە سۆباکەی دیوی قەراخدا شۆڕ بووینەوە، لوولەسۆبا هەڵدێرێکی نشێو بوو ڕێگا بە شێوەی پێچاوپێچ لەو چیا بەرزەوە تا خوارەوە دەرۆیشت، هەر لەبەر ئەوە ناویان لێ نابوو لوولە سۆبا، تا ئێوارە لە قورگی شاخەکەدا ماینەوە، کەڵەشێرە وشکەوە بووەکەمان برژاند و خواردمان، تاریك داهات و گونیە و جل و بەرگی خۆمان لە سمی وڵاخەکان پێچا تا لەسەر تاشە بەردەکان دەنگیان نەیەت، بەرەو

خوار بووین بۆ دۆڵەکانی گوندی سۆڵە، بەرەبەیان لە دوورەوە وڵاخێك بەدی دەکرا کە نزیك بووینەوە شۆڕشگێڕێکی بریندار بەسەرپەشتی وڵاخەکەوە لەسەردەم ڕاکشا بوو سەری بە لاملی وڵاخەکەیا شۆڕ ببووەوە و وڵاخەکەش دەلەوەڕا، خوێنی لاڕانی بریندارەکە دەچۆڕا، هەردوو پێیەکانی بە زگی وڵاخەکەوە توند بەسترا بوو، بەڵام هیوای ژیانی نەما بوو چونکە بەشی ژیان خوێنی تیا نەما بوو، دیاربوو هاوڕێ شۆڕشگێڕەکانی بۆیان دەرباز نەکرابوو، بەجێیان هێشتبوو، کاتێ ناوچەکەمان جێهێشت ئیتر نەمزانی چی بەسەر هات.

لەوە بەدوا جم و جۆڵ و ناوچە گۆڕین دەبوو تەنها بە شەو بێت، چونکە هیچ ئاوەدانییەك لە بەری قەراخ و گەرمیان و شارەزوور نەما و هەر گوندێکیش مابوو کە دەستی سوپای پێ نەگەیشتبێ بە چۆڵی مابووەوە، زۆربەی بەرزییەکان کرابوونە مۆڵگای هێزەکانی ڕژێم ،شەوێکی تاریك و لێزمەی بارانیش دایدەکوتاین شۆڕشگێڕەکان هەڵدەلەرزین، ئەحەسوور ڕەباتی بەهەڵەداوان خۆیگەیاندە پێشەوەی ڕەتڵەکە گەیشتە سەرلەشکرو وتی:

_ قوربان گەر وابڕوا ناگەینە ئەوبەری جادەو ڕۆژمان لێدەبێتەوە.

سەرلەشکر زۆر پەست بوو.

- چی؟ .. ڕۆژدەبێتەوە؟ ئەیمن چی لەم هەموو شۆڕشگێڕەبکەم ؟

_ وەڵاقوربان مەگەر بگەڕێینەوە لەگوندێکا خۆمان بشارینەوە.

- کورە تۆئەڵێی چی ئەحەسور بۆ من لەگەڵ حکومەتا چاوشارکێ ئەکەم؟ ئاخرئەم هەموو شۆڕشگێڕە لە کوێدا بشارمەوە، ئەی جەنابت کە ئەتزانی ناگەینە جێ بۆئێمەتخستەڕێ؟

- چیبکەم قوربان باران و قوڕوچڵپاو دوای خستین.

بەرژەوەندی شۆڕشگێڕان لەوەدا بوو خۆیان دەرنەخەن، چونکە ناوچەکان کەسیان تیانەما تا بەرگری یان لێ بکرێ و ئەوانیش مایەی بژێوو دالدەی شۆڕشگێڕ بن، بەر لەوەی رۆژ بێتەوە گەیشتینە گوندە چۆڵ کراوەکەی گاوانی، هەر چەند کەسێك و خۆمان کرد بە ژوورێکدا و لەسەر چیمەنتۆ ساردەکەی ژوورەکان بەجل و بەرگی تەڕ و قوڕەلیتاوییەوە ڕاکشاین، تەنها چەند شۆڕشگێڕێك نەبێ بێداری ئێشك گرتن بوون زستانێکی تەمەن درێژ بوو سەرمای گەیاندبووە ناوەڕاستی بەهار.

دەمەو ئێوارە رێمان گرتەوەبەر بەرەو ڕێگای گشتی نێوان سلێمانی و کەرکوك لە بازیانی ڕۆژهەڵات، ڕۆژ بە ڕۆژ هیوامان لە کزی دەدا، تێکڕای دانیشتوانی ناوچە داگیر کراوەکان دەگوێزرانەوە و بێ سەر و شوێن دەکران تا دەهات ماندوو بوون و شەونخونی و نەسرەوتن و برسی یەتی شۆڕشگێڕ پەرەی دەسەند، شەوێکی تاریك و پڕ لە ڕەهێڵەی هەور و باران بوو هەموومان پێڵاوەکانمان لەپێ داماڵیبوو، تالە قوڕا جێنەمێنێت و تۆزێکیش باری پێ یەکانمان سووکتر بێت، کاتژمێرێك بەر لە ڕۆژهەڵاتن گەیشتینە ڕێگا قیرەکەی تاسلوجە لەبەری گوندی ئەڵلاییییەوە، هێزەکەمان زۆر بەپەلە بوو لە تێپەڕبوون و گەیشتن بەوبەر، کەچی خەبات تەواو پەکی کەوتبوو.

خەبات لاوێکی منداڵی ئیمام قاسمی کەرکوك بوو پاش ئەوەی کۆلیجی کشتوکاڵی تەواو کردبوو پەیوەندی کردبوو بە شۆڕش، ئەو منداڵی شار و بە نازداری گەورە ببوو لەش و لارێکی نەرم و ناسکی هەبوو، ئەو شەوە بەهۆی ڕیپێوانێکی زۆرەوە بەپێ خاوسی لە قوڕدا ژێر پێیەکانی خوسابوون بە گەیشتنی قەدپاڵە بەردەلان و

تەڵاشدارەکەی تاسلۆجە ژێر پییەکانی هەنجن هەنجن ببوو، تۆقلەکانی پێ ی ئاوەزڵە و خوێناوی پیادا ئەچۆڕا.

سواری ولاخێك کرا، ولاخەکەیش لە ئێمە بێ هێز تر و توانای ڕۆیشتنی نەمابوو، منیش هاو دەنگ و هاورێگای ئەوبووم، پاش پەڕینەوە هێزەکانمان دوور کەوتنەوە و لە چاو ون بوون هەر چەند هێزم دەدایە خۆم و لە پشتەوە پاڵم بەو ولاخەکەوە ئەنا بێ سوود بوو، ئەو وەکو ئۆتۆمبیلێکی چەقیوو، بە ئارەزووی خۆی دەجوولا، حەقی خۆی بوو نەجوولێ، ئەو هەم برسی بوو هەم ماندوو هەستیشی بە مەترسی نەدەکرد، ئیتر بۆچی بە ئارەزووی خۆی نەجوولێ؟.

بەری ئاسمان ڕووناك دەبووە، زەردەی خۆرەتاو لە ئاسۆگە دەرکەوت ئێمەش بە نێوان دووگرددا سەرەو ژوور دەبووین، کەسەرمان لە پەڕی دۆڵەکەوە دەرهێنا، ڕێك لەبەردەم یەکێ لە قوللەکانی دوژمن خۆمان بینیەوە تازەکار لە کار ترازابوو ڕۆژبە تاقی ئاسمانەوە بوو پێویستی بە بێ دەنگی و خۆشاردنەوە نەدەکرد، خەبات داوای کرد هەرچی زووە بەجێ ی بێڵم و چارەنووسی خۆم لەگەڵ ئەو یەك نەخەم بەلام من ئەوەم پێ نەدەکرا، لەگەڵ مشت و مڕی من و خەبات و تەپ و هۆڕی پێ ی ولاخەکەیا کەسێك لە پشت دیوارە بەگڵ هەڵچنراوەکەی قوللەکەوە سەری دەرهێنا و هاتەسەر دیوارەکە و بەچیکانەوە دانیشت، لاوێکی تەمەن بیست ساڵ بوو شەرواڵێکی رەش و کراسێکی سپی لەبەردا بوو، خاولییەك بەسەر ملیەوە بوو پێڵووی چاوەکانی ئاوساوی پاش خەوێکی زۆربوون، نێوان ئێمە و ئەو چەند مەترێك بوو، ئێمە لە جێگای خۆمان وەستاین و تەماشای ئەومان دەکرد ئەویش وەك

زینــدەوەرێکی بــۆ یەکــەم جــار دیبــێ واق ورمــا و دەیڕوانییــە ســەر و ڕوخساری ڕیشن و پەشێواو و چڵکن و ئەندامی لە قوڕا شڵپاوی ئێمە دیمەنێکی سەر سووڕێنەر بوو بۆ ئەو ئەو چەکدارێکی رژێم بوو، یەکێك بوو لەو هەڵاتووانەی کە ئامادە نەبوو بچێتە بەرەی جەنگی عێراق و ئێران، پێشتر تاوێك بەبێ دەنگی و تەنها بە زمانی چاو قسەمان لەگەڵ یەکتر کرد.

کــوڵێ نیــشتیمان پــەروەری و ڕازی ویــژدانی کەوتــەکار و هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی:

+ ماندوو نەبن.!..

– هەر بژیت برای باش.

+ نیازی کوێ تان هەیە بڕۆن؟

– بەرەو گەورە دێ

+ ئەی بۆ ڕووتان کردووەتە ڕێگای دووکان.

– ئاخر ئێمە زۆر شارەزای ئەم ناوچەیە نین.

+ دە وەرن بەمـدیوی ئێمـەیا داگـەڕێن و سـەرەو ژوور بـڕۆن، خێراکـەن ئەگینا تیا ئەچن.!!

– باشە سوپاس، ئەی تۆزێ نانتان لانی یە؟

+ با...ڕاوەستن!

ئەوەندەی یەك و دوو چەن سەموونێك و قوتویەگۆشتی سەرەگای پێداین و بەرێ کەوتین.

دەمەو نیوەڕۆ لە گوندەکانی گەبە و گولیجە گەیشتینەوە هێزەکانی خۆمان، پێشتر هەوڵم دا لە خانووە ڕووخاوەکانا پێڵاوە کۆنەیەك بدۆزمەوە چونکە ژێر پێیەکانی خۆیشم لە تۆقڵە و برینا ئەوەندەی لە پێیەکانی خەبات کەمتر نەبوو. دوو تاکە پێڵاوم هەریەکە و لە جۆرێ پەیدا کرد، بەڵام ژێرەکانیان نەبێ تۆزێ بەکەڵك بوون سەرەوەیان بەپێوە بەند نەدەبوو، هەر چۆنێ بوو بەبەن و پەڕۆ ژێرە پێڵاوەکانم توند بەستە ژێرپێیەکانمەوە، هەر چەندە لە ڕۆیشتندا بەنەکە لاپێ یەکانمی دەبریەوە بەڵام چار نەبوو، من زیاتر ژێر پێم لامەبەست بوو، بۆ ئەوەی یەکجاری کەنەفت نەبم.

هێشتا گوندەکانی ئەو ناوچەیە ئاوەدانی یان تیابوو، ئەوانیش ئامادەباشی ڕووداوبوون، هەواڵی کارەساتەکەی بەری قەراخ و گەرمیانیان پێ گەیشتبوو، گەیشتینە کەلوەزێك، باوك و کوڕێك لەسەر توولە ڕێگاکە دانیشتبوون چەند فەردەیە ئارد و ساجێکیان دانابوو پەیتا پەیتا هەویریان هەڵدەشێلا و هەر بەدەم ڕێگاوە هەر شۆرشگێرێك و کوکەڵە [٢]نانێکی بچوکیان پێ ئەدا، ورەی بەرزی ئەو باوك و کوڕە هێندەی تر ورە و دەماری بەرگری یان دەدایە شۆڕشگێڕەکان، ناوچەکانی قەڵاسێوکا و شوان و کۆیەش وەك شارە مێروولەیەکی پەشێوی خەمخۆری پێش باران بەیەکا دەهاتن و هەوڵی ڕێگا چارەیان دەدا، هەموو لەیەکتریان دەپرسی: چی بکەین باشە؟... خۆمان هیچ بۆ منداڵ و ژن و کچ و کاڵ و پیر و پەك کەوتوەکان چی؟...

---

[٢] کوکەڵە – ئەونانە بچوکەی منداڵ دەیداتە دایکی تا بۆیبدات بەسەر ساجا.

ئێمە دەمانزانی هیچ چارەیەك نی یە، بەڵام بەهەر جۆرێك بوو دڵمان دەدانەوە و هانمان دەدان خۆیان دەرباز کەن

ئەوان هەندێکیان هێشتا بیٚ ئاگابوون لە ڕووداوەکان، سەرگەرمی سەرکەپران و ماڵۆڵان [۲] و ئاودێران بوون، خۆیان دابووە دەست ڕەحمەتی خوا و غەزەبی ڕۆژگار و ڕژێم. هێزەکانمان زۆربەیان لە زیٚ پەڕینەوە و ئێمە لەگەڵ سەد و پەنجا شۆڕشگێڕ لە بەری شوان و قلاسێوکا ماینەوە لە ژێر فەرمانی سەرلەشکرێکا، هەر چەند دەمانزانی مانەوەمان بیٚ سوودە و کاری پێویستمان لە دەست نایە، بەڵام شەرمەزاری بوو پێش ڕووداو خەڵك و ناوچەکە بەجیٚ بهێڵین، هەر چۆنێك بیٚ وەکو چاوساغێك لەناو خەڵکەکەیا بین و هانیان بدەین ناوچەکە جیٚ بیڵێن و خۆیان دەربازکەن. سەر لەبەیانی بڕیارماندا تا پاش نیوەڕۆ لە گوندی هەنجیرە هەر لە دەم زیٚ بمێنینەوە.

کاتژمێر چوار و پێنجی ئێوارە بوو، لەسەر سەکۆی مزگەوتی دیٚ لەسەر پشت ڕاکشابووم و سەرم خستبووە سەر بەردە نوێژەکە و تفەنگەکەیشم لەگەڵ خۆما درێژ کردبوو، گوێم لە دەنگی فرۆکە جەنگی یەکان بوو دەنگێکی سادە نەبوو هاژەیەکی کوت و پڕی لێوەهات، بەپەلە دەرپەریم و خۆم گەیاندە پەڕی ئاوایی، چوار فرۆکە بە ئاسمانەوە بوون، دوانیان لە پەڕی ئاسمانەوە لوتیان بەرەو خوار شۆڕکردەوە ڕووەوکەپرەکانی دەم زیٚ هەریەکە و دووبریسکەی لێوە هات و پاش کەمێك دوکەلێکی سپی چڵکن پانتایی کەپر نشینەکانی

---

۲ ماڵۆڵان _ برەبەرهەمی دروێنە کراو

داپۆشی مووشەکی بۆمبی گازی ژەهراوی بوون، یەکێ لە مووشەکەکان کەوتە ناو زێ وە، ئیتر نازانم کەوتنی مووشەکەکە بۆ ناو زێ لە دەست دەرچوون بوو یا فرۆکەوانەکە خۆی بوو کە کەمێك ویژدانی جوولابێت و ئارەزووی لە کوشتارێکی کەمتری بووبێت، بەهەر حاڵ کوشتارێکی بێ شوماری لە کەپرەکان و ناو دێی گۆپتەپە خست لە نێر و مێ ی بە تەمەن جیاواز، تا ڕۆژی دوایش کۆرپە ماسی یەکانی روبار دەکەوتنە سەر ئاو مێگەلێکی زۆری بێ گیان چاوەڕوانی شەنگەبێری بوون بیاندۆشێ بەلام نەشەنگەبێڕی و نەشێر،.. خەڵکەکە وەك ڕۆژگاری ئەسحابولفیل هەریەك بەلایەك هەڵدەهاتن و هیوایان بە هیچ هێزێك نەبوو کە بەرگری یان لێ بکات لەو شالاوە ڕەشە کوژی یەدا، هێزی شۆڕشگێڕێکی قەلەندەر و کۆرپەیەکی ساوا لەیەك ئاستدا بوون بەرامبەر بەو چەکە کۆکوژە.

ئەمە نە شەڕی دەستەویەخە و گیزەی گوللەیە، نە تۆپ و خومپارەو فرۆکەیە. ئەمەقینی دارێژراوی ساڵەهای ساڵی قڕکردنی نەتەوەیەکە، ئەوشەوەمان لە گوندە چۆڵ کراوەکەی هەنجیرەیا بەسەر برد و سبەینێ سەر لەشکر بە تەواوی هێزەکەمانەوە بەرەو بناری خاڵخالان کەوتنەڕێ و تەنها من و سێ شۆڕشگێری تری هێشتەوە لەناو گوندا وتی:

دکتۆر ! تۆ و مام نوری و خەپەکوێر و جەمال لێرە بمێننەوە بەلام ئاگاتان لە خۆتان بێت تا دێینەوە.!

مام نوری شۆڕشگێڕێکی بەساڵا چووی کورتە بالای کەم هێزبوو، خەپە کوێر ناوی ڕاستەقینەی غەفوور بوو، شۆرشگێرێکی نزیکی

سەرلەشکر خۆی بوو، منداڵی گەرمیان و قسەکانی قوت و لە نوکتە دەچوون، ژیانی لا شیرین بوو جەمال لاوێکی تازەپێگەیشتووی منداڵی کەرکوك و لە گەڕەکی تورکمانەکانا گەورەببوو، نازانم چۆن پەیوەندی بە شۆڕشەوە کردبوو دیار بوو بە ڕێکەوت ببوو بە شۆڕشگێڕ. ئەو پێشتر ڕاکردووی جەنگ و لە گەرمیان خۆی حەشاردابوو.

منیش دەبوو وەك سەر دەستەیەك لە گەڵیان بم، من بۆ خۆم دەمزانی ئەمانە بە کەڵکی لێقەومان نایەن بەڵام نەمزانی هێزەکەمان لە گەڕانەوەیا زۆریان پێ ئەچێ، بۆیە هیچم نەوت تەنها :

بەڵێ باشە قوربان فەرمانتان بەجێ یە!

دوای ڕۆیشتنی ئەوان سەرم کرد بە کولانەی مریشکەکانا لە هێلکەی بەجێماو دەگەڕام، دوو هێلکەم لە ژێر کونە لانەکەیا دۆزیەوە. خەپە کوێرم ناردە سەر بانێژەکە چاوی لە دەرەوە بێت تا هێلکەکان ئەکوڵێنم، لەگەڵ تۆزێ ئاوا خستمە قوتویەکی بچوکەوە لە تەنوربانەکەیا نامەسەر ئاگر، هێشتا هێلکەکان نیوەکوڵ نەبووبون، گوێم لە باوکەڕۆ و براڕۆی خەپە بوو، لە تەنووربان دەرپەریم خەپە کوێر بە دەستی چەپ تفەنگەکەی گرتبوو بە دەستی ڕاست ئەیکێشا بەسەری خۆیا، ئەوەندەی کێشا بوو بەسەریا کلاو و جامانەکەی وەك کلاوێکی گەورە هاتبووە سەر برۆکانی بەشێوەی لاوانەوە ئەیوت:

+دکتۆر گیان هێلکەی چی ئەکوڵێنی؟ بەخوا ئەو هێلکەیە نابێتە نسیبمان مەگەر لەو دونیا.

–ئەوە چی یە خەپە؟ تێك چووی؟

+کوڕە ئەی چۆن تێك نەچم دکتۆر وەرە سەیری ئەم لەشکری ڕۆمە بکە بەرەو ئێرە دێن.

چـوومه سـەر بانێژەكـە لـەلای خەپـەوە سـەیری لای گونـدی گۆپتەپـەم كـرد، لەشـكری چـی بـەدەیان تانـك و زریپـۆش و دەیـان ئۆتـۆمبێلی پـڕ لـە سـەرباز، لەمسـەری گۆپتەپـەوە لەسـەر ڕێگـا قیرەكـە ڕاوەسـتا بـوون چـاوەڕوان بـوون بـەرەو لای ئێمـە بـەڕێ كـەون. لـە گۆپتەپەیـشەوە تـا گونـدی كـانی هـەنجیر كـە ئێمـەی لێ بـووین تـەنها چارەكە كاتژمێرێك بووبە پیادەڕەو، وتم:

–ئینجا ئەمە باوكە ڕۆ و براڕۆی ئەوێ خەپە كوێر؟

هەرچـەندە كردارەكـەی خەپـەم بـە ڕاسـت و نـاخی دڵ نـەدەزانی، چـونكە ئـەو هەمیـشە كـردەوە و هـەڵس و كـەوتی بـۆ نوكتـە و پێكـەنین ئەنجام ئەدا، خێرا تفەنگەكەی خـۆم لەگـەڵ كۆڵـە پشـتی یـە دەرمانەكانم خستە كۆڵ و بیكەیسی یەكەم هەڵگرت و ئەوانیش هەركەسە و تفەنگی خۆی، ئاربیجییەك و چەند گوللە ئارپیجییەك لە زەوی مابوو وتم:

–هەریەكـە و دوو گوللـە ئـار، پـی، جـی هـەڵگرن و ئـار، پـی، جـی، یەكەش با خـەپە هەڵیگرێت، خـەپە هەر ئەوەندەی گوێی لە قسەكانم بوو وتی:

+ چـی؟..ئـار پـی جـی هـەڵگرم؟ وەڵا بابـە مـن هـەڵیناگرم مـن لـە ژیانما كەی ئار، پی، جیم تەقاندووە تا ئێستا بیتـەقێنم؟ ناتانەوێ بەم ئاخر و ئۆخرەیە گوێشم كەڕ كەن.

–خەپە تكات لێ ئەكەم ئێستا كاتی قسەی قـۆڕ نـی یـە، خـۆمن نـاڵێم بیتەقێنە ئەڵێم هەڵیگرە باجێ نەمێنێتی.

پاشـەوپاش لـە گونـد دوور كەوتینەوە، لەسـەر گردەكە درایـنە بەر تۆپ و مەترەلۆزی تانكەكان، لەگەڵ دوكەڵ و تـەپ و تـۆزی تۆپـەكانا بـە تـل ئـاودیوی گردەكـە بـووین ئـاخر جێگاكـە دەرفـەتی بـەرەنگار

بوونەوەی نەبوو، ڕەنگە تەقەیشمان بکردایە بەبێ هیچ زیان گەیاندنێك بە دوژمن چەن موشەکێکی کاتیۆشای ژەهراوی یان ڕەوانەی ناو گوند بکردایە و هیچمان دەرنەدەچووین و دەبووینە هۆی بەرەنگار بوونەوە و تەواوی هێزەکانیشمان فرۆکەیان دەگەیشتە سەر و بە ژەهری شیمیایی قڕ دەکران، بۆیە پاشەکشێ باشترین ڕێگا چارەبوو. قسەکانی سەر لەشکری پێشووم ئەهاتە یاد ئەو ئەیوت:

لە هەندێ کات و شوێن پاشەکشێ سەرکەوتن و ئازایەتی یە نەك شکان و ترسنۆکی.

بەهەڵەتەکاندا داکشاین و لە گوندی داوەقوتە گەیشتینە هێزەکەمان. لە چەند ڕۆژێکدا تەواوی بەرزییەکان کرانە قوللە و مۆڵگای دوژمن، خەڵکی ناوچەکەش لە گوند و هەڵەتەکان ئابلۆقە دەدران و ڕاپێچ دەکران، تەواوی هێزە سەد و پەنجا کەسییەکەمان لە هەردەکانی مامرەش و مامڵەسی ناوچەی شواندا کەوتنە بەر ئابلۆقەی سەربازییەوە. کۆپتەرەکان تەواوی کەڵەکەکانی دەم زێیان سووتاند بوو، دابویانە دەم ڕووبارەکەوە ئیتر ڕۆژانە دەبوو لە کەندڕ و کەڵوەزوو ئاودڕدا خۆمان حەشاردەین و شەوانەش جێگاکانمان بگۆڕین.

سەر لە شەکرەکەمان شۆڕشگێڕێکی خۆڕاگر و خاوەن ئەزموون بوو لە جوڵانەوەی پارتیزانانەدا، ئەوپێشتر ئەفسەرێکی پایەبەرزی سوپای عێراق بوو، منداڵی شارۆچکەی دووز خورماتوو بوو بەهۆی ئازایەتی و لێهاتوویی یەوە گەیشتبووە پلەی سەرهەنگ سەر بە وەزارەتی بەرگری عێراقی و باڵیۆز سەربازی نێوان ئێراق و ئینگلیز و هۆڵەندە و نەمسا بوو، خێزان و منداڵیشی هەر لە هۆڵەندابوو، تا ڕۆژێکیان یەکێ لە وەزیرەکانی عێراق بەئیش و کار دەچێتە دەرەوەی

ولآت و شەویٚ لەگەڵ سەرلەشکری حازریمان دادەنیشیٚ، وەزیر لە قسە و باسەکاندا بابەتەکە دیٚنیٚتە سەر کورد و بە توندی دائەبەزیٚتە سەر کورد و قسەی ناشیرین و سووك لە دژی گەلەکەمان دەکا، ئەمیش لەگەڵ ئەو هەموو خزمەت و سالآنەی کە بۆ حکومەتی عیٚراق بەسەری بردبوو، گیانی نەتەوایەتی ڕەگیٚکی نەمرە و چیتر خۆی پیٚ ڕاناگیریٚ، دەمارگیر دەبیٚ، بیٚ سیٚ و دوو شووشە ئاویٚك هەڵدەگریٚ و لە تەپڵی سەری جەنابی وەزیرا ورد و خاشی دەکا هۆشی لەبەر ئەبڕیٚ، دەچیٚتە باڵیۆزخانە و خۆی دەگەیەنیٚتەوە کوردستان و پەیوەندی بە شۆڕش دەکا و بەپلەی سەرلەشکریٚکی شۆڕشگیٚر دەسبەکار دەبیٚ.

ئیٚمە ڕۆژ بە ڕۆژ لە دەنگ و باس و زانیارییەکانی سەرکردایەتی بیٚ ئاگا دەبووین چونکە نەمان دەتوانی ئامیٚرە بیٚتەلە دەستی یەکەمان بەکاربهیٚنین و قسەیان لەگەڵ بکەین، چەند جاریٚك لەگەڵ داگیرسانی ئامیٚرەکەیا یەکسەر تۆپیٚکی دوور هاویٚژ لوورەی دەهات و لە نزیکی ئیٚمەوە نالەی دەکرد، بۆیە تەنها جاروبار سەر لەشکر ڕادیۆ بچکۆلەکەی ئەکردەوە و گویٚمان لە هەواڵەکانی ئیٚزگەی کوردی بەغدا ئەگرت کە مژدەی پاك کردنەوە و دەست بەسەراگرتنی گوند و خەڵکانی ناوچەکانی کوردستانی بە گەلی عیٚراق و عەرەب دەگەیاند.

تا دەهات برسیٚتی و ماندویەتی تەنگی بە شۆڕشگیٚرەکان هەڵدەچنی شەوانە سەرمایەکی پڕ ئاونگ نەیدەهیٚشت تۆزیٚ بە نۆرە بخەوین، بەڕۆژیش لە بنارە ئاودڕەکاندا دەبوو وشیار بین، نەکو غافڵگیری هیٚزە پیادە ڕەوەکانی دوژمن بین.

سەرلەشکر باسی ژیانی هۆڵەندە و جۆرەکانی خواردەمەنی ئەویٚی بۆ ئەگیٚڕاینەوە ئەو ئەیوت:

– به بایەخترین و گرانترین خواردنی هۆڵەندە و وڵاتانی ئەسکەندەنافی گۆشتی بۆقە.

منیش وتم:

+هەر ئەم بۆقانەی لای خۆمان؟

–بەڵێ بەڵێ هەر ئەم بۆقانە.

لەگەڵ خەباتی هاوڕێما تەماشیەکی یەکترمان کرد وتم:

خەبات! هەستە وەرە بە شوێنما!...

قسەکانی سەرلەشکرمان بەجێهێشت و لە زەلکاوەکەی بەردەم خۆمانا چەند بۆقێکمان گرت و پوختە پاکمان کرد، هەتا بۆمان راوکرا بۆقمان هەڵکزان و یەك لە دوای یەك قوتماندا، پاشان چەند بۆقێکیشمان بۆ سەر لەشکر هێنا و بەرکوڵێکی پێ کرد.

دوبارە ڕادیۆکەی خستەوە بناگوێی و وتی:

ڕاوەستن بێ دەنگ بن بزانین چێ ئەڵێت.

رادیۆ لە هەواڵی پاش نیوەڕۆیا وتی:

–(هێزە چەکدارەکانمان سەرەڕای ئەوەی توانیان زۆربەی ناوچەکانی باکوری عێراق لە تێکدەر و خیانەتکارەکان پاك بکەنەوە، ئێستاش لە پێشڕەویدان بەرەو ناوچەی شوان و کۆیە، ئێمەش وەك سەرکردایەتی گشتیی هێزە چەکدارەکان زۆر چاك ئاگادارین کە کۆمەڵێ خۆفرۆش و بەکرێ گیراو، لەگەڵ سەرلەشکری تێکدەرەکانا لە هەردەکانی شوان گەمارۆ دراون شەرت بێ چارەنووستان بۆ دۆزەخ بێت!).

سەرلەشکر ڕادیۆکەی کوژاندنەوە و پێکەنینێکی دروست کراوی بۆ کرد و هەواڵەکەی بە هیچ نرخاند.

بەڵام لە ڕاستیدا وانەبوو لە دوای ئەو هەواڵە، ترسێکی زۆر کەوتە دڵی شۆڕشگێڕەکانەوە، ترس لە بەرامبەر مەرگ نا، ترسی لە ناو چوونێك کە بەبێ ئەوەی خوێن بایی خۆمان و خەڵکەکە زیانمان گەیاندبێ بە دوژمن، ترسی بەکارهێنانی چەکی نامەردانەی شیمیایی بەرامبەرمان، ئەگەر بکرایە شاندێکی دوژمن بێتە لامان و داوای جۆری شەڕمان لێ بکات ئێمە ئامادەبووین لە مەیدانێکی دەیان تانك و ڕووبەڕووی لەشکری بێشومار ببینەوە.

بەڵام دوژمن سەروبنی زمان و چەکی دەستی تەنها شیمیایی بوو، ئەو هەواڵی ڕادیۆیە بوو بە پرسیارێك و ناوسکی منی دەخوارد بۆیە لەوە زیاتر خۆم پێ ڕانەگیرا و ڕووم کردە سەرلەشکر وتم:

+ باشە قوربان بەپێ ی ئەو هەواڵەی ڕادیۆی بەغدا و سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکان لەبەغداوە کە ئاگاداربن و بزانن ئێمە وا لێرە گەمارۆ دراوین؟ بێگومان هێزەکانی ئەم ناوچەیەی کە دەوریان گرتووین، زۆر بە چاکی دەزانن کە هەریەکێ لە ئێمە لەسەر چ مەترە چوارگۆشەیەکی ئەم چەم و دۆڵە دایە.

-بەڵێ بەڵی بێگومان.

+ ئەی باشە چاوەڕوانی چین و بۆچی نایەنە سەرمان؟

-من لە دوو ئەگەردا بۆی ئەچم کەبۆچی نایەنە سەرمان. یەکەمیان ڕەنگە ئەفسەرە پایەبەرزەکانی ناوچەکە کۆنە دۆستی پێشووی خۆم بن کاتێ کە لە وەزارەتی بەرگری بووم و دڵیان نەیەت بێنە سەرمان و بیانەوێ هەلێکمان بۆ برەخسێ و دەرباز بین.

دووەمیان ڕەنگە لە ڕووی دۆستایەتی نەبێ، بەڵکو چاك دەمناسن و دەزانن کە تا چ ڕادەیەك کەللەشەق و دوژمن کوژم و جەسارەتی ئەوە نەکەن بێنە سەرمان و لە زیانی زۆری خۆیان بترسن.

. ئەی چەکی کیمیایی یان نییە؟

. با هەیانە ئەویش لەبەر ئەوەی ناوچەکە گونجاو نییە بۆ ئەو کارە و بە هەر چوار لای ئێمەدا هێزەکانی خۆیانە و بایەکەی بەهەرلایەکدا بڕوات کیمیایی لەشکرەکەیان قڕ دەکات.

ئەگەر ڕۆژی هێلکە کولاندنەکەی گوندی هەنجیرە بەم شێوەیە بیرم بکردایەتەوە بمزانیایە کە لەم ناوچەیە دوژمن توانای بەکارهێنانی چەکی شیمیایی نییە کە خۆیانی لێ نزیك بن، دەبوایە بە بیکەیسیەکە کۆمەڵێکی چاکم لەسەربازەکان شەل وکوێر بکردایە داخەکەم ئەمەم نەدەزانی.

تا ڕادەیەك ئێمە باشتر بووین لەو کۆمەڵە شۆڕشگێرەی کە ڕەوانەی دۆڵە وشکەکان کرابوون بۆ خۆشاردنەوە و لەوێ گەمارۆ درابوون، هەرچۆنێك بێت ئێمە چۆرە زەلکاوێکمان لەبەر دەست بوو بۆ خواردنەوە و ڕاوە بۆق ئەوان چەند ڕۆژ بێنانی لەلایەك و لەتاو بێئاوی و لاواز بوون و لە بێ هێزیدا هەندێکیان میزی خۆیان کردبووە قەباخی زەمزەمیەکانیانەوە و دایان نابوو، تۆزێ فێنك بێتەوە و پاشان خواردبوویانەوە.

ئێوارە سەرلەشکر هێزەکانی هەموو کۆکردەوە لە بنارێك و چووە سەر بەرزی یەك و وتی:

برایانی شۆڕشگێڕ بە تەواوی گوێم لێ بگرن تا بڕیارێکی یەکجاریتان پێ بڵێم. ئێمە بەهەر شێوەیەك بوو تا ئەمڕۆمان بەسەر برد

که پتر له مانگێکه ئابلۆقه دراوین له ئێستا به دواوه ڕەنگه هەندێکتان چاوەڕوانی دوا فرمان بن بۆ دیاری کردنی چارەنووسی خۆمان بۆیه پێتان دەڵێم هەریەکێ له ئێوه ئازاده بۆ توانینی ڕزگارکردنی خۆی چ به تاك چ بەکۆمەڵ کێ دەتوانی خۆی رزگار بکات باسەر پشك بێت کێ دەیەوێ له ئێمه جیابێتەوه و بچێته ناوچەیەکی تربۆ خۆشاردنەوه بابڕوات، کێ دەتوانێ له ڕێگای خزم و کەسی و چەکداری ڕژێمەوه له شارا بمێنێتەوه با بڕوات، کێ چەك و تفەنگ جێ ئەهێڵێت جێ ی بێڵێ، کێش دەیبارت با بیبات.

چونکه ئێمه لەسەدا یەك ئەگەری دەرچوون و رزگاربوونمان هەیه، کێش چارەنووسی خۆی لەگەڵ ئێمه دائەنێت باڵەگەڵمان بێت.

کۆمەڵێ شۆڕشگێر بڕیاریان دا بگەڕێنەوه ناوچەی گەرمیانی بەری باشوور و قادر کەرەم و بنارگل، هەندێك ڕوویان کرده شارۆچکەی چەمچەماڵ و کەس و کار و دۆستی کۆن لەوێ.

ئەم هەموو بێ هیوایی یه لەلایەك و ترسی فایرۆسی بێ باوەڕی بەیەکتریش کەوته نێوان شۆڕشگێڕەکانەوه، چونکه شۆڕشگێڕەکان پێك هاتبوون له چەندین کۆمەڵەی جیاواز هەر کۆمەڵێ شۆڕشگێڕی ناوچەیەك و خەڵکی ناوچەیەکی تر جاروبار هەواڵی خیانەتی شۆڕشگێڕمان دەبیست له دژی شۆڕشگێڕی هاوسەنگەری خۆی، ئەوەندەی تر له یەکتر بێ باوەڕ دەبووین چونکه ڕەوشت و پێکهاتەی هەموو مرۆڤێك وەکو یەك نی یه، گیان شیرینه بەڵام نەمدەزانی کێ بەو شێوەیه بیر دەکاتەوه که مردنی مەردانه شیرین تره و کێش به خۆپەرستی و گیان خۆویستی و وره ڕووخاوی بیر دەکاتەوه.

کەس لە کەسی تر ڕازی نەدەبوو کە چەکەکەی بەشێوەیەکی ئامادە باشیانە لە ڕووی ئەوی تردا ڕاگرێت.

خۆ ئەگەر هاورێ یەکی شۆڕشگێری دڵسۆزیش بەجۆرێ دەستی بۆ چەکەکەی ببردایە، دەبوو بە وریایی یەوە سەرنجی بدەیت نەك کارێ لە دەستی ڕووبدات.

پاش چەند ڕۆژێ رادیۆکە هەواڵی هێرشێکی بەربڵاوی سوپای ئێرانی ڕاگەیاند بۆسەر هێزەکانی سوپای عێراقی لەبەرەی شەڕەکانی شارەزوور و قەسری شیریندا، سەرلەشکر ڕادیۆکەی کوژاندەوە و وتی:

-ئێستا کاتی ئەوەیە چەند شۆڕشگێڕێك بچن بەرەو خوار و چاودێری ئەوبەری زێ بکەن لە سنووری ناوچەی شێخ بزێنی.

هەر ئەو شەوە چەند شۆڕشگێڕێك بەرێ کەوتن و دەمەو بەیانی هاتنەوە وتیان:

هێزە کۆماندۆکەی ئەو بەری زێ ڕۆیشتوون تەنها بە درێژایی سنوورەکە چەند قوللەیەکیان جێ هێشتووە.

سەر لەشکر ئەمجارەیان دە شۆڕشگێری تەرخان کرد هەوڵ بدەن بۆ دروست کردنی کەڵەکێك، پێشتر لە ماوەی دوو شەودا کەوتینە گەڕان بە شوێن ئۆتۆمۆبێل و تراکتۆرە شکاو و سووتاوی پاشماوەی بۆمبارانەکانا و چوپی تایەکانمان دەرهێنا هەرچی بەکەڵك بوو، پاشان پەمپێکی هەوا تێکردنی تایەی ماتۆریش پەیدا کرا و چەند شۆڕشگێرێك کەوتنەڕێ بۆ ناوچەی شێخ بزێنی.

لە ماوەی حەوت رۆژدا بە کێردی نێزەی تفەنگەکان لە سپی دارەکانی دەم زێ بەشی کەڵەکێکیان بڕیەوە و بە پشتێنە کەتانەکانیان پێکەوە شەتەکیاندا لەگەڵ چووپەکانا و دوان لە شۆڕشگێڕەکانیان

ڕەوانەکردەوە بە دوای هێزەکەماندا کە دەبوایە لە کاتژمێر دوانزە تا یەکی نیوە شەوی داهاتوو بگەینە ئەوێ، ڕێگای نێوان ئێمە و شوێنی کەڵەکەکە نۆ کاتژمێربوو بە پیادەڕەو درێژایی شەوگاریش هەر نۆکاتژمێر بوو، بۆیە دەبوو ئەو ڕێگایەمان بە نیوەی ئەو کاتە ببڕیایە بە نەرمە ڕاکردن، لەبەر ئەگەری ڕێك نەکەوتنی پەرینەوە، تاکو بگەڕێینەوە شوێنەکانی ئێستای خۆمان، بە چوار کاتژمێری ئەمسەر و چوار کاتژمێری ئەوسەر، چونکە ئەو ناوچەیە بە ڕۆژ بە کەڵکی مانەوەی شۆڕشگێڕ نەدەهات، کاتێ گەیشتینە ئەوێ هەروا دەرچوو کە سەرلەشکر پێشبینی کردبوو، دوو شۆڕشگێڕە شارەزاکە ڕێگاکەیان نەبردەوە جێگای مەبەست و ڕێیان لێ وون بوو، بۆیە بە ناچار بە ڕاکردن گەڕاینەوە شوێنەکانی خۆمان هەر ئەو شەوە شەش شۆڕشگێڕ لە ڕێگا پەکیان کەوت و بەجێمان. ناچار بووین ڕۆژی دوایی دەمە وئێوارە هەمان ڕێگا بگرینە بەر بەرەو شوێنی کەڵەکەکە، بەڵام پێش بەڕێکەوتن شۆڕشگێڕەکان نیوە فەردەیە ئارد و قوتویە ڕۆنی پێنج کیلۆیی و دە پانزە کیلۆ شەکریان لە کەلۆەزێکا دۆزی یەوە، پاشماوەی بەجێماوی خەڵکە ئەنفال کراوەکە بوو، بە چاکم زانی ئەم سێ بابەتە بکەم بە حەڵوای ئارد، شۆڕشگێڕێك مەنجەڵێکی پەیدا کرد، مەنجەڵەکە نیوە بەرمیلێکی بڕاوە بوو، هەر چەند ژەنگێکی زۆری پێوە بوو بەڵام کارەکەی ئێمەی پێ ئەکرا، ڕۆنەکەم داخ کرد و لە تەنەکەیەکی ژەنگاویا شەکرەکەم بۆ خستە هەندێ ئاوی چەمە زەلکاوی یەکەوە و حەڵوام پێ گەیاند، حەڵوا لە ڕۆژێکی ئاسایی و تێر و پڕیدا خواردنێکی دەگمەن و خۆشە نەخاسمە لە ئەمڕۆی ئابلۆقە دراویدا و برسێتیەتیەکی وابێهاوتادا هەرکەسە و بەشە حەڵوای خۆی لە پشتێنەکەی گرێدا.

من نیازم وابوو هەر رۆژە و نیوە کەوچکێکی لێ بخۆم چونکە دەمزانی حەڵوا وا بەئاسانی تێك ناچێت.

ئاخر من چنگە وردە نانێکیشم ماوەیەکی زۆر لە پشتێنەکەمدا هێشتبووەوە و نەمدەوێرا بیخۆم نەك تەواو بێت، تا کەڕووی هەڵهێنا و پاشان بە ناچاری بەکەڕووەکەوە بە چەند ڕۆژێ خواردم.

ئەو ئێوارەیە خەبات تووشی دان ئێشەیەکی توند بوو بە هۆی خواردنی حەڵواکەوە، هەرچەند من دەرمانی سڕکردنم پێ نەبوو، بەڵام گازی دان کێشانم پێ بوو، ئازارەکەی پەرێشانی کردبوو، داوای کرد بەبێ سڕکردن بۆی هەڵکێشم، چارەیەك نەبوو، ئازارێکی یەکجاری لە ئازاری بەردەوام باشترە، دوو شۆڕشگێڕم خستە ئەملا و ئەولای و هەریەکە و باڵێکی خەباتیان گرت و پێیەکانیشیان لەگەڵ پێیەکانی ئەوا گیر کرد و تۆزە لۆکەیەکم خستە سەر ددانەکەی تا هەست بە ساردی دەمی گازەکە نەکا، ئینجا توند بەهەردوو دەستم گازەکەم گوشی و هەتا هێزم تیابوو ڕامکێشا و دەرم هێنا خەبات لەگەڵ هاوارێکی کورتا لە هۆشی خۆی چوو، پاشان بە ئاوپرژانێك بەدەم و چاویا هۆشی هاتەوە پاش نیو کاتژمێر خەوی لێ کەوت.

شەو بە سەراهات و ڕێگا دوورەکەی شێخ بزێنیمان گرتەوەبەر، خۆمان گەیاندە کەڵەکە دروست کراوەکەمان و هەرجارەی دە شۆڕشگێر دەپەڕینەوە، دوا کاروان ئێمە لەگەڵ سەر لەشکر چووینە سەر کەڵەکەکە کەڵەکە وانەکەشمان هاولاتیەکی بەجێماوبوو، ئەو شارەزای یەکی باشی هەبوو لە پەڕاندنەوەی کەڵەك، مام نوری لەودیوی سەوڵی کەڵەکەوە دانیشتبوو کە بە درێژیی لەسەر کەڵەکەکە دانرابوو، کەڵەکەوان وتی:

-هەمووتان خۆتانگرتووە؟

وتمان بەڵێ.

کەڵەکەوان دەسکی سەوڵەکەی گرت و لەگەڵ هاویشتنی بۆ ناو ئاوەکە، شلێپەیەکی گەورە هەڵساو شتێك لەگەڵ سەوڵەکەیا کەوتە ئاوەکەوە، شتەکە لای پشتەوەی منەوە کەوتە ئاوەکەوە، بەڵام لەو تاریکیەدا نەمزانی چی بوو، شۆڕشگێڕەکان ڕوانیانە ئەملا و ئەولای خۆیانا و وتیان:

ئەڕەوڵا مام نوری دیار نەما! وەڵا وابزانم مام نوری بوو کەوتە ئاوەکەوە، خێرا یەکێکی تر کە جلی لەبەرا نەبوو خۆی تێ فڕێ دا و مام نوریمان دەرهێنایەوە مام نوری وەکو بوخچەیەك کەوتە ئاوەکەوە و وەکو بوخچەش دەرهێنرا ئەو لە کەوتن و هاتنە دەرەوەشا ورتەی لێوەنەهات، بەهۆی سەرمای ئەو دەم زێ یە و ساردی ئاوەکەش ئەوەندەی تر زمانی لەگۆچوو، وەکو شۆڕەبی دەلەرزی جل و بەرگەکەی شڵپەی دەهات کەچی جامانەکەی لەسەر دامالی و کردیەوە لەبەرچەوری و چڵکنی هێشتا وشك بوو پاش پەڕینەوە، شۆڕشگێڕێك بلوزێکی زیادە و یەکێکی تر تراکسوتێکی ژێرەوەیەیان پێ دا و کەوتینە ڕێ، قوڵلەکانی دەم زێ هەستیان بەشڵپ و هۆڕی پەڕینەوەمان کردبوو بۆیە چەند فیشەکێکی گڕداریان بەسەرمانا تەقاند، بەر لەوەی ڕۆژ بێتەوە گەیشتینە هەردەکانی دەشتی کۆیە و گوندە ڕماوەکەی گۆپتەپەی باکوری زێ.

دەمەو ئێوارە لە دوورەوە چەند شۆڕشگێڕێکمان بەدی کرد کەلەسەر ڕێگاکەمان بوون، نزیکبوینەوە یەکەم شۆڕشگێڕ پێی گەیشتم ئافرەت بوو.

ئـەوان شۆڕشـگێڕی ڕێبـازی کۆمۆنیـست بـوون، بـەڵام مـن زۆر شێوەی ئەم ئافرەتەم دەکرد، زۆر پرسیارم سەبارەت بە ئەسڵ و فەسڵی ئەوکرد ئـەویش دیـاربوو شـێوەی منـی دەکـرد بۆیـە پرسـیارەکانی پـێ نـاخۆش نـەبوو. لـە کۆتـایی دەرکـەوت کـە ئەمـە پەخـە شـێتی هـاوڕێ منداڵی خۆمە.

پەخە نـاوی پەخـشان بـوو لـە تەمـەنی چـوار پێـنج سـاڵیدا چـەند ساڵێك هاوڕێی منداڵیم بوو.

من و پەخشان و شەرمین و جوامێر هەمیشە پێکەوە یاری کوڕانە و کچانەمان دەکرد. ڕۆژێکیـان یـاری ماڵماڵۆچکێمان دەکـرد، پەخـە بـوو بە خێزانی من و شەرمین خێزانی جوامێر، پێشتر ئێمە لەملاوە هەنـدێ بەردمان ریزکرد و کردمانە سنووری ماڵی خۆمـان، ئـەوانیش لەوبـەرەوە سنووری ماڵی خۆیان دیاری کرد، لە شـانۆی یاری یەکەیا پاش چەند چرکەیەك ئێوارە داهات و بڕیارماندا بۆ شەونیشینی، بچینە سـەردانی ماڵی جوامێر و شەرمینی دراوسێمان.

کەوتینەڕێ و بە دوو هەنگاو گەیشتینە مـاڵی جـوامێر، ئەوانیش بـــەرەو پیرمـــان هەڵـــسان و پێڵاومـــان دانـــا و چـــووینە ئـــەودیوی بەردەڕیزکراوەکانەوە و دانیشتین پاش بەخێرهاتن و ئەحواڵ پرسـی لـە قەباغە سیفۆنا هەندێ وردە خەیاریان بۆ دانایین، خواردمان و هەڵساین و گەڕاینەوە لەگەڵ دانیشتنا لە ماڵی خۆمان وتم:

ئافرەت زۆر ماندووم جێگاکە ڕاخە با بخەوین، پارچە گونێیەکی هەڵوەشاومان هەبوو، پەخە ڕای خست و لەسەری ڕاکشاین و باوەشمان دا لەیەکتر جوامێر و شەرمینیش لەو لاوە کردیان بە شەو.

لەگەڵ پەخەیا دەم و لوتمان زۆر لەیەکەوە نزیك بوو، هەردوو کونەلووتەکانی پڕ بوون لە چڵم لەگەڵ هەناسەیا گلۆپێکی گەورەی کرد و تەقی بەدەم و چاوی منا، دەستی پەخەم لە ملی خۆم ڕاپسکان و یاری یەکەم هەڵوەشانەوە.

بۆیە کاتێ لەگەڵ پەخەیا یەکترمان ناسیەوە یادگارییەکی شیرین، پێکەنینی دەخستە سەر ڕوخساری هەردووکمان.

ئەو ئێستا خێزانی کابرایەکی شۆڕشگێڕە و منیش شۆڕشگێڕی قۆڵێکی تر، لە کونە لوتەکانی پەخە ورد دەبوومەوە، حەزم دەکرد بپرسم لەکەیەوە کونە لووتەکانی وشکیان کردووە، ئایا ئێستا گلۆپ ناتەقێنی بە دەم و چاوی مێردەکەیا؟

بەڵام ئەمانە پرسیار بوون لە دڵی خۆمدا و پێکەنینی ئەویش وەڵامەکەی بوو.

شاخی باواجی پۆل پۆل شۆڕشگێڕی لە ئامێز دەگرت و بۆ دواجار بەسەر شانی خۆیدا تێپەڕیانی دەکرد، ئێمەش پۆلێك بووین لەو شۆڕشێگڕانە و ئاودیوو بووین بەرەو بناری کلکەی چیای سەفین و هەورێ و دۆڵی ئاکۆیان و کونەکۆتر و ماکۆك، شنەی قەدپاڵەکان بۆنی هەزاران گوڵی دەکرد بەگژماندا، کنێر و چنوور عەترا و شەنی ڕۆحی خەڵکی کوردستانیان دەکرد، دەیان هەزار کوردی بە تەمەن جیاواز بێ بەری کران لەو چیا سەوزانە و لە شنەی بۆندار و ئاوی سازگاری کانیاوەکان و دیمەنی کێوە سەربڵندەکانی تاقی ئاسمان، هەزاران و هەزاران بیرکردنەوەی پچڕپچڕی پڕ لە نائومێدی سۆزی گریانێکی پەنگ خواردووی لە گەرووی شۆڕشگێڕەکاندا جێهێشتبوو، لەگەڵ تێپەڕبوون

بەسەر هەر دیمەنێکا دەیان ئەگەر و نیشانەی پرسیار دەهاتنە بەرچاوم و هەر جارەوە بە شێوەیەك وێنەکانم هەڵدەسەنگاند.

باشە تۆبڵێ ی خەڵك و خاکی ئەم وڵاتە لە ڕوانگەی دوژمن و دوژمنانی ئازادیخوازیدا ئەوەندە تاونبار بین کە ئەمەمان لەگەڵ بکرێت ؟

تۆ بڵێی خواوەند ئێمەی نەکردبێتە پرۆڤەی ڕۆژی حەشر؟ تۆ بڵێی وەك رووداوی تۆفانی نوح ئێمە نەبینە بنیاد نانەوەی دووەم چەرخی مرۆڤایەتی لە وڵاتەکەماندا؟

باشە ئەم هەموو خەڵکەیان بۆ کوێ برد؟

باشە ئێمە وا هەر دەڕۆین و هەر دەرۆین بە هەنگاوە بێ هێزەکانمان ئەم چیا زەبەلاحانە قوت دەدەین بۆ کوێ دەچین؟

جار جارەش دەمگوت ئەو شۆڕشگێڕانەی کە لە کاتی ئابلۆقەدراویدا خۆ کوژی یان کرد هەقی خۆیان بوو.

پاشانیش دەمگوت.. نەخێر، هەر چۆنێك بێت تۆزقاڵێ ئاسۆی سەربڵندی و تروسکەی ئاوات لە شۆڕشگێڕدا بمێنێ باشە.

بیرم لە ڕاپەڕینەکانی گەلانی جیهان دەکردەوە.

بیرم لە مردوو خۆرەکانی لینینگراد دەکردەوە.

بیرم لە ساتەکانی لەشە کرم هەڵێناوەکەی حەزرەتی ئەیوب دەکردەوە.

دەڵێن مار بە درێژایی زستان دەنوێ و، قەڵەڕەشیش لە حەفتا ساڵیا باڵق ئەبێ و وشتریش بە درێژایی چەندین ڕۆژ بەسەر ئەو لمە داخەیا ڕێ ئەکات و ئاو ناخواتەوە، بۆ برسیەتیش پشووی درێژە دیارە

به خۆڕایی ئەو ئاژەڵە پشوو درێژە نەخراوەتە بەردەستی ئەو کۆمەڵە خێوەت و دەشت نشینەوە.

ژیان لە بەردەستی ئەوان پشوو درێژی و خۆراگری دەوێ. بەڵام ئێمەی زادەی چیا دەبوو پشوویەکی درێژترمان هەبێت و نەمانبوو. بۆیە وا قڕ دەکرێین !. ئای لەو کێچەی بەردەستی کوێر دەکەوێت، ئینجا بزانە چۆنی دەپلیشێنێتەوە.

ئێمە وەك کێچێك بووین و بەردەستی کوێر کەوتبێ.

## -١١-

لــە گونــدەکانی هــیران و نازەنینــەوە گەیــشتینە پاشمــاوەی وێرانکــاری و بەشــیمیا ســوتاوی گونــدی شــێخ وەســانان، بەچــیا سەختەکەی هەورێدا هەڵگژاین، سەرم سوڕمابوو لە مەڵکەنی گوندی مەلەکان ئاخر ئەم گوندە لە بەرزی و دوورایی ڕێگای هەشت کاتژمێر لەڕێگای گشتی ئۆتۆمۆبیلدا بوو، بۆمبای شیمیایی ئەوێشی گرتبووەوە ئــەوان لــە جیهــانی ئــاژاوە و ڕوداو بــەدەربوون، بــێ ئاگــا لــە تــاوان و هۆیــەکانی شــەڕ و شــۆڕ، بــۆ دەبــێ ژەهــری بۆمباکــان شــنەو ئاسمانی ئەوانیش بلەوتێنێ.

هێشتا دانیشتوان تاك و تەرا لە گوندی مەلەکاندا مابوونەوە، ئەوان بەشان و باڵی خۆیان، گەلێ جوانکاری و ئاسانکاری ناو گوندیان دەستەبەر کردبوو، دیوار و خانوەکانیان بە تەپڵی سەری چیای هەورێ وە لە تاشەبەرد و تەقتەقە بەردەکان وشکە کەڵەك هەڵچنیبوو، ئەرز و دیواری ناوەوەش بە گڵێکی سپی سواخ کرابوو، پێ دەچوو ئەو گڵەیان لــە شــوێنێکی دوور دەســتەوە گەیانــد بێتــە گوندەکــەیان، حەوشــە و حەساریش بەردەلانێکی یەکپارچەی تەخت، سەر ژوورەکان بەگەڵاجار و نیرگەی گوێز و بەڕو داپۆشرابوو.

لە سەرووی گوندەوە حەوزێکی گەورەیان لە دەم کانیەکی پڕ ئاو و دروست کردبوو لەوێ وە لوولەکێشی ئاویان گەیاندبووە مزگەوت و

یەکەیەکەی ماڵەکان، لۆدەی ماڵاتیشیان دوور لە ئاوایی دروست کرد بوو.

لە هەموو لایەکەوە درەختە بەرهەم هێنەرەکان باوەشیان کردبوو بەو گوندە بچکۆلەیەدا سەرمایەی سەرەکی بژێوی ئەوان بەرهەمی سروشتی بادام و گوێز و هەنگوێن بوو. ماڵات و پەلەوەریش بۆ پڕکردنەوەی کەم و کورتییەکان.

مرۆڤ بە ڕێبواریش گوزەری ناو گوندی بکردایە ئاواتی ژیانێکی هەمیشەیی وەك ئەوانی دەخواست.

کەچی بڕیاری قڕکردن، لە ئاسمانەوە باری بەسەر ئەوانیشدا.

لەوێوە داگەڕاین بەرەو دۆڵی ئاکۆیان و دامێنی چیای ئاسۆس لە تەختاییەك لە کەنار چەمێکی بچوك بۆ پشووی جگەرە خۆرێك لاماندا من و خەبات پێڵاوەکانمان لەپێ داماڵی و پێ یەکانمان نوقمی ئاوەکەکرد و کەمێك لە حەڵوای چەند ڕۆژ لەمەو بەرم پێ مابوو.

هەریەکە و بەقەد گوێزێکمان لێ خوارد و ئەوی ترم خستەوە پشتێنە کە تانەکەم وگرێمدا، لەسەر گازەرەی پشت ڕاکشاین.

لە ئالۆشی کەلەکە و باخەڵم بە ئاگا هاتم یەك کاتژمێر تێپەڕیبوو بەسەر ڕۆیشتنی شۆڕشگێڕەکانا، ئەوان ڕۆیشتبوون و ئێمە جێمابووین و لە تەنیشت شارە مێروولەیەکی قەرەباڵخەوە خەوتبووین، بۆنی حەڵوای ناو پشتێنەکەم چووبوو بەسەریاندا و هێرشیان هێنابووە سەر سنگ و بەرۆکی من تا ڕووتم بکەنەوە و حەڵواکەم لێ بسەنن، بەپەلە جل و بەرگم داماڵی و مێروولەکانم تەکاند و حەڵواکەم بۆ ئەوان بەجێهێشت.

خەباتم هەڵسان و کەوتینە ڕێ و خۆمان گەیاندە هێزەکەمان لە سنووری گوندی وەرتێ. لەوێ گرمە و هاڕەی داستانێکی پڕ دووکەڵ و

ئاگراوی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا مۆتەکەی برسیەتی بەرۆکی ئێمەی بەردابوو.

پاش مانەوەمان لەو ناوچەیە چەند ڕۆژێ، لەسەر داوای بروسکەی سەرکردایەتی دەبوو بگەینە سنووری ئێران شۆڕشگێرەکانی ئەو ناوچەیە دوو وڵاخیان بۆ ئامادەکردین کە پەك کەوتوەکانیان پێ بگەیەنینە ئەوێ.

وڵاخەکان پاڵانی ئەستووریان لەسەر پشت بوو، شەوێ لەسەر چیای ئاسۆس بۆ تاوێك پشوو تا ڕۆژ ئەبێتەوە لە تەختەیەك کۆزەمان کرد هێشتا بەفری بەین بەرد و نشێوەکان مابوون، پاش ماندووبوون و ساردبوونەوەی لەشمان سەرما تەواو هەراسانی کردم، ئاخر من تەنها چۆخە و شەرواڵێکم لەبەردابوو، ناچار بووم کۆپانی وڵاخەکە لە پشتی بکەمەوە. لە زەوی دامناو لای پشتەوەیم بە جەواڵەکەی سەرپشتی وڵاخەکە داپۆشی، لای پێشەوە کونێکی بچووکی لێ مایەوە، خۆم گرمۆڵەکرد و وەکو قرژانگ پشتاوپشت بۆی گەڕامەوە و چوومە ژوورەوە، ژێر کۆپانەکە زۆر گەرم بوو هێشتا هەڵاوی گەرمی لەشی وڵاخەکەی تیامابوو.

لەشم هەستی بە ئارامی یەکی گەرم دەکرد. لە کونەکەی پێشەوە دەمڕوانییە وڵاخەکە ئەو لەسەرما دەلەزری، نەفەرەتم لە ویژدانی مرۆڤانەی خۆم دەکرد کە جل و بەرگم لەو بەستەزمانە کردەوە و بۆخۆم بووم بە خاوەنی. ئەو زمانی نەبوو ئەگەرنا کارێکی پێ دەکردم کەبا بەدەواری شڕی نەکردبێ، بەڵام چارەیەك نەبوو سەرما فشاری بۆ هێنام و ویژانی لێ بڕیم، بۆیە ئەو بەستە زمانەم بەسزای سەرمایەکی توند گەیاند.

بەرەبەیانی ڕۆژی دوایی گەیشتینە گوندەکانی قڕناغە و پشت ئاشان کە لەمبەر و ئەوبەری چەمە سەرە و لێژە پڕ تەوژمەکەی بناری چیای قەندیلا بوون ئەو ڕوبارە بە هێزە لە بەفری تواوەی قەندیل پێکهاتبوو، دۆڵێکی سەرەوژووری بەردەڵان بوو.

خەڵکی هەردوو ئاوایی لە ناوچەکەدا بوون بەڵام گوندەکانیان جێهێشتبوو بۆ سەرووی دۆڵەکە هەڵکشا بوون و لەوێ خێوەتیان هەڵدابوو بە چیغی قامیشی چنراو لای خوارەوەی خێوەتەکانیان دەورەگرتبوو.

هەندێکیان سەر لەبەیانی دادەگەڕانەوە بۆ ناو دێ و سەرگەرمی کشت و کاڵە بەراویەکان دەبوون، پاش نیوەڕوانیش دەگەڕانەوە خەریکی مێگەڵ و ماڵاتەکانیان دەبوون.

کوخێکم لە نزیك کانیەکەی سێبەری دار گوێزەکەیا دروست کرد و کردم بە بنکەی تەندروستی.

لە کوخەکەمدا سەرگەرمی تاوتوێ کردنی دەرمانەکانم بووم، دەنگێك لە دەرەوە دەیگوت :-

دکتۆرەکە لە کوێ دائەنیشێت؟

شۆڕشگێڕەکان وتیان :

هەر لەو کوخەی لای خۆتەوە.

دەنگەکە دەنگی ئافرەت بوو بەر لەوەی چاوم پێ ی بکەوێت، سەربەخۆ کەوتمە دڵە کوتێ. بۆخۆشم نەمدەزانی بۆچی؟ من پێم خۆش نەبوو ڕووبەڕووی نەخۆشی و چارەسەر و کێشەکانی ئافرەتان ببمەوە، نازانم بۆچی شەرمم لەو کارانە دەکرد، ئاخر ئێمەی شۆڕشگێڕ لە ڕووی ڕەگەز بازی یەوە خۆمان وەك ئەسپێکی خەسیوو دەبینی خۆمان وەك

جوانویەکی ماندوو کراوی گێرە و ماسولکە شل دەبینی. ئەو گەیشتە بەردەگای کوخەکەم.

چی ببینم؟..

پەری یەکی بالا بەرزی گەنم ڕەنگ و چاوکاڵی پەروەردەی چەمە کەفچڕەکەی بناری چیای قەندیل.

من گەلێ ناوچە و گوندی گەرمیان و کوێستانم کردبوو، بەڵام تا ئێستا ئافرەتی بەو شێوەیە قەڵەم ڕێکم نەدیبوو، ئەوەندەی تر دڵە کوتێکەم پەرەی سەند. ئەو کۆپەریەکی یەك ساڵەی هێنابوو کە تووشی کۆکە و هەوکردنی سیەکان ببوو، پاش پێدانی هەندێ دەرمان و دیاری کردنی چەند دەرزییەکی دژە هەوکردن کە ڕۆژانە لێی بدرێ پاشان پرسیم:

+ئەم کۆرپەیە هی خۆتە؟

. بەڵێ.

+ باشە بۆ چاودێری ناکەیت و ئەهێڵی تووشی نەخۆشی بێت؟ ڕەنگە خوێندەوار نەبیت.

-خوێندەواریم هەیە چۆن نیمە؟ هەمووی چەند مانگێکە لە قەلادزێ وە گەڕاومەتەوە ئێرە، پێشتر لەوێ قوتابی بووم، تا پۆلی چواری دواناوەندیم خوێندوە.

بە گوێرەی قسەکانی پێ دەچوو ڕاست نەڵێت کە ئەم کۆرپەیە هی خۆی بێت، بەڵام من درێژەم پێ نەدا و بەڕێم خستن.

ڕۆژی دوایی کۆرپەکەی هێنایەوە بۆ دەرزی لێدان، ئەمجارەیان ئەو پرسی:

+ دکتۆر کچەکەم شێوەی لە خۆم دەچێت؟

-بەڵێ زۆر زۆر شێوەی ئەچێتەوە سەر خۆت، بەڵام ئەگەر بڵێم ئەمە منداڵی خۆت نییە، وا دەزانم بەهەڵەدا نەچووبێتم.

+چۆن منداڵی خۆم نییە؟ بە چیا ئەزانی منداڵی خۆم نییە؟

-بەوەی کە هەمووی چەند مانگێکە قەڵادزێت جێ هێشتووە و تا ئێستا قوتابی بوویت.

وەڵامی ئەو بزەیەکی پر تەلیسم و کەمەند کێشانەبوو، بەچاو تێگەیشتم کە کچێکی ڕۆشنبیرە و کەسێکی بێ سەرمایەی وەك منی لە بەرگی شۆڕشگێڕێکدا خۆش دەوێت، ئەو منداڵە خوشکی بچوکی ئەوبوو.

بەڵام من هەمیشە خەیاڵەکانم وەکو بۆق هەرجارە و بەڕەنگێ دەگۆڕی و بیرم لە بەڵێنەکانی خۆم دەکردەوە، من بەڵێنم بە خۆم دابوو کوردستان بپارێزم پیر و منداڵ و ئافرەت بپارێزم، دەبوو فاتیش بپارێزم، ئەو ناوی فاتی بوو دانیشتووی پشت ئاشان و بۆ خوێندن چووبووە ماڵی باوای لە قەڵادزێ.

بە دزی دڵمەوە خۆشم دەویست، دەترسام، نەبادا من ببم بە هۆی شکاندنی کلیلی شەرمی ئەو و پاشانیش بۆ کەسێکی تری جێ بهێڵم و ئاواتەکانی باوەڕم بە با بڕوات.

فاتی پەیوەندییەکی هاوڕێ یانە و دۆستانە و مرۆڤانەی پەیدا کرد لەگەڵ مندا. بەیانیان بەسواری ئەسپێکی ڕەشی چوار پەل سپی بەرەو خوارە دەبووە بۆ پاچەکۆڵە و بژار و خزمەت کردنی باخچە بەرئاوییەکانی ناو دێ و ئێوارانیش هەر بە تولە ڕێگاکەی ناو دارگوێز و سێوەکاندا دەگەڕایەوە، بەیانیان لە ڕێگا لای دەدایە لای کوخەکەی من و شوشەیەك شیر یا هەندێ پەنیر یا کەرەی بۆ دەهێنام، لەخەو هەڵی

نەدەساندم شیر و پەنیرەکەی دەخستە ناو گیایەکەی دەم کانیاوە ساردەکەی ژوور سەرم و دەڕۆیشت، ڕچە ڕێگاکەی فاتیٚ ڕادەبورد بەناو مۆڵگای شۆڕشگێڕ و کۆڵبەرەکانی سنووردا، جل و بەرگ و ڕوخساری پەری ئاسا و پلەمارۆی ئەسپە شێکەی سەرنجی هەموو شۆڕشگێڕ و کۆڵبەرەکانی ڕادەکێشا، بەڵام فاتیٚ لەگەڵ جوانیەکەیدا ڕەوشتێکی سەنگین و سامێکی پڕ بە هەیکەلی خۆی و ئەسپەکەی تیا بەدی دەکرا.

زۆر حەزم دەکرد ئەوکاتانەی قسە لەگەڵ فاتی دەکەم چەند وشەیە زیاتر لەگەڵیا بدوێم و نەمدەوێرا. هەوڵم ئەدا هەتا زووە جێی بێڵم، کەچی فاتی زۆر سەربەرزانە و لە من ئازاتر بوو دەیگوت:

چییە دکتۆر خۆتۆ پێشتر چاکتر بویت ڕۆژ بە ڕۆژ ئەڵێی قسەت لەبیر ئەچێتەوە.

هەرچەند فاتی تۆزیٚ زمانی فس بوو، بەڵام زۆر لەمن زمان بە بڕشت تر بوو، ئەونەیدەزانی من واکەوتومەتە بەینی بەرداشی شکۆمەندی شۆڕشگێڕی و خۆشەویستی خۆیەوە و هێور هێور دەمهاڕیٚ.

لەدامێنی چیای قەندیل زەمینم ڕاخستبوو سێبەری دارگوێزێکی پیرم دابوو بەخۆمدا.

شەماڵ لەپانتاییەکانی کوردستان و پێدەشتی گەرمیانەوە دەهات و بەسەر سنگی من و بناری قەندیلا هەڵدەکشا، جاروبار دەبوو بەنەسیمێکی نەرم و خۆی لەنووکی تفەنگەکەم دەسوی و وزەی لێوە دەهات، هێدی هێدی بلوێری بۆ گیانی شەهیدانی گەرمیان و کوێستان دەچڕی، بۆ یەکەم جاربوو گوێم لەدەنگی گریانی تفەنگ بێت، وەك فەرمانێکی مەحاڵی بەسەرا سەپێندرابێت و نەیتوانیبیٚ بەجێی

بگەیـــەنێت، پێموابـــوو تفەنگـــە ماندووەکـــەم بـــۆ رووخـــساری چـــیا دووکەڵاوییەکان و بەردە خوێنیاوییەکان دەگری.

خێزانێکـــی تـــارکراوی گـــەرمیان دوا قافڵـــەی بـــەجێماوی ئـــەنفالبوون گەیـشتنە لام، ماندوویـەتی رێگـای دووری مـان و نـەمان بەتەوێڵیانـەوە بوو، ئەوان دوو کۆرپەی خوار حەوت ساڵ و باوك و دایکێك بوون.

سبەینێ باوکـە کۆرپـەکانی هەریەکـەو لەقەفەسـێکی ترێـدا بـەدووتای ولاخەکـەیا هەڵواسـی و هـەموو پێکـەوە بەچـیای قەنـدیلا هەڵگـژاین، چوونکە فەرمانی بارینی شیمیایی ئەو بنارەشـی گرتـەوە، بۆیە دەبـوو خەڵك و شۆرشگێر روو لـەولاتی ئێـران بکـەن، مـن لەپێـشەوە ولاخەکـە لـەدوای مـن و بـاوکی دوو منداڵەکـە لـەدووی ئـەوان و دایکیـشیان لەپـشتەوە بەهـەنگاوە بـێ هێزەکـانی توولـە رێگـای سـەرەو ژووری قووتـدەدا، باوکەکـەیان بـەدەم رێگـاوە هۆرەیـەکی گـەرمیانی بەسـۆزی دەکـرد، خێزانـە نەشمیلەکـەی هەناسـە برکـێ و ئـاخ و پرمـەی گریـانی تێکەڵ بەیـەکتر دەکـرد، منـیش ئیشتهای گریـانم دەکـرد، بـەلام خـۆگرتر بووم.

جاروبار منداڵە گەورەکەی دەیپرسی:

– بابە؟

+ گیانی بابە

. ئێمە هەردەرۆین و هەردەرۆین بۆ کوێ دەچین؟

+ نازانم رۆڵە گیان

. ئەی بۆ ناگەین؟

+ئەگەین باوەگیان

. ئەی بۆ گوندەکەمان بەجێهێشت؟

+ تا نەمانکوژن

. کێ ئەمانکوژێ؟

+ عەسکەر

. عەسکەرەکان؟

+ بەڵێ

ـ ئەی تۆ دەتگوت هەمووکەس خۆی هەر ئەمرێ، ئیتر ئەوان بۆ ئەیانەوێ بمانکوژن؟

+ بۆ ئەوەی زووتر بمرین

. یاخوا خۆیان زووتر بمرن.

ورده ورده لەرێگای وشکەڵانی دەبووینەوە و گەیشتنینە سەر ترۆپکی قەندیل، بەفرێکی بێ ئامان بوو، من بەفری بەو شێوەیەم تەنها لەفیلمەکانی سینەمادا بینیبوو، دۆڵەکان پڕبەفر بوون، چیاکان چەند گەورەبوون بەفر ئەوەندەیتر گەورەیکردبوون، من سەرم سووڕمابوو، جاروبار کەللەی خۆم رادەوەشان دەمگوت نەك ئەمە خەونبێت، ئاخر لەرێگای چەند کاتژمێرێکەوە تا ئێرە من لەسێبەری دارگوێزەکانا راکشابووم، چۆن دەبێ ئەم سەرچیایە بەم جۆرە بەفری لێبێت، بەهەر چوارلادا وشکایی و خاك بەدیار نەدەوکەوت، بیرم لەبانێك و سەد هەوای ئەم وڵاتە دەکردەوە، بەرچەرێی هەڵدێری بەفرا هەنگاوم دەناو لەقوڵایی بیرکردنەوەدا بووم، هەموو بیرکردنەوەکانم بەهاوارێك پسان.

یا ئەڵڵا......

وڵاخەکە گلێنگیدا و لەرێگا دەرپەڕی.

ئەی هاوار بیگرنەوە......

پانتایییەكی خزی سەربەرەوخواری بەفرین بوو، ولاخەكە كەوتبووە سەرلا و بەتیژی بەرەوخوار دەڕۆیی، ئافرەتەكە قریشكاندی، جامانەكەی شاخ كەوتە خوار و كێوەكان یەك بۆ یەكتر دەیان نالاند، منداڵەكان لەقەفەسە تریكان دەرپەڕیبوون بەتیژییەكی لەڕادە بەدەر بەرەو ئەو بەفراوە بێ ئامانە دەچوون كە لەبناری بەفرەكەوە دەردەچوو، ئەمانیش بەرەو ئەو هەڵدەیرە دەخزان، گرتنەوەیان لەدەسەلاتی كەس نەبوو، باوكەكەیان خۆی بەدوویاندا هەڵداو بەدوویاندا دەخزا، نەك ئەوانی پێ رزگار نەدەبوو بەڵكو كەس بەتەمای ئەویش نەما، ئافرتەكە وەك باز دیچریكاند و سەدای لەكێوە بەفرەكانەوە دەگەڕایەوە، ئەو سواری ولاخێكی تر كرا چوونكە توانای هەنگاو هاویشتنی نەمابوو، پاش چەند كاتژمێرێكی گەیشتینە بارەگای شۆڕشگێڕەكانی دۆڵی شێخ ئایش لەولاتی ئێران، لەوێ رووبارەكە هێمن دەبووەوە و قولایی دەگەیشتە ئەژنۆیەك، تەرمی باوك و دوو منداڵەكەمان گرتەوە و گۆڕێكی گەورەو دوو گۆڕی بچووكمان بۆیان هەڵكەند، پێدەچوو فریشتەكان بەگوێی ئەو منداڵەیان چرپاندبێت كە دەبێ ئەمڕۆ بۆ خۆیان بمرن بۆیە ئەو پرسیارە سەیروسەمەرانەی لە باوكی هاومەرگی دەكرد.
ئافرەتەكەیش تێكەڵ بەئاوارەی ئۆردوگاكانی ئێران كرا و كەس نەیزانی چی بەسەرهات.

## -١٢-

مۆڵگامان لە خوارووی گوندی دۆڵەتوو دانرا و لەگەڵ چەند شۆڕشگێڕێك مۆڵەتی چەند ڕۆژێكمان وەرگرت بۆ پشوویەك بچینە شارەكانی ئێران لە گەڕانەوەیا كۆمەڵێ دەرمان و پێویستی پزیشكیم كڕیبوو بیهێنمەوە بارەگای خۆمان، لە پیرانشەهر سواری ئۆتۆمۆبیلێكی لاندرۆڤەر بووم بەرەو سنوور هەرچەند پسولەی مۆڵەتەكەم ڕۆژێك بەسەرچوو بوو.

لە بازگەی دەرەوەی شارۆچكەی پیرانشەهر ئۆتۆمۆبیلێكەیان ڕاگرت، سەربازێكی بەرپرسی بازگەكە دەرگای پشتەوەی كردەوە ئێمە چواركەس بووین، دایانبەزاندین و كەوتە پشكنینی جانتاو شت ومەكی ناو ئۆتۆمۆبێلەكە، جانتاكەی منی هێنایە خوارەوە، وتی:

+ئەمە هی كێیە؟

. هی منە، بۆ؟

+ئەمەت لە كوێ هێناوە؟ ئەمە قەدەغەیە بۆ كوێی ئەبەی؟

ئۆتۆمبێلەكەی بەڕێ خست، منیش لەسەر لەتە خشتێك دانیشتم و پشتم نا بە دیواری ژوورە بچكۆلەكەی بازگەكەوە. ئەو بازگەیە بە كەمی ئۆتۆمبێلی لێوە ڕەتدەبوو. كابرای پاسدار هاتە تەنیشتمەوە، تاوێ تەماشای كردم و وتی:

+پسولەت پێیە؟

-بەڵێ.

پسولەکەم دەرهێنا و دامە دەستی، تەماشایەکی کرد وتی:

+بەڵگەی ترت پێ نییە؟

- نەء

+ ئاخر ئەم پسولەیە ماوەی تەواو بووە!

- هەر ئەوەم پێیە.

+پێ دەچێ لە تێکۆشەرانی کوردی عێراقی بیت؟

. بەڵی وایە

- ئەرێ بەڕاست ئۆتۆنۆمیەکەی ئێوە چی بەسەر هات ؟

تێگەیشتم ئەمە توانجێکە و ئەو دەزانێ ئێمە کوردستانێکی وێران و چۆڵمان جێهێشتووە و گاڵتەجاڕیم پێ ئەکات و ئەمیش هیچی لەکاربەدەستێکی حکومەتی عێراق کەمتر نییە بەرامبەر بە کورد، ئەوان بە هەردوولا ئاگری هەشت ساڵ جەنگیان لەسەر پشتی کورد کوژاندەوە، بۆیە وتم:

. ئۆتۆنۆمیەکەمان وەکو کەربەلاکەی ئێوەی لێهات.

کابرای سەرباز زۆر تێك چوو. ئەم وەڵامە خەنجەرێك بوو بۆ ئەو بێ دواکەوتن منی دایە پێش بەرەو لای ئەفسەرێکی گەورەی فەرماندەی ناوچەکە، پاش ئەوەی بەتەکان و سیخورمە گەیاندمیە ئەوێ، وتی:

- قوربان ئەم کابرایە دەرمانی پێیە و نیازی وایە بەرەو سنوور بیبا، قسەکانی منیشی بۆ گێڕایەوە، ئەفسەرەکە پێشتر زۆر توڕەبوو، پاشان پرسیاری لە من کرد و منیش ڕاستیەکەم پێ گوت:

رووی کردەوە سەربازەکە و گوتی:

ئەم پیاوە ڕاست دەکا جەنابت کەربەلات ڕزگار کرد؟ تا توانج لەو بدەیت؟

دەی خێرا، هەر ئێستا دەیبەیتەوە بازگەکە و سواری ئۆتۆمۆبێلێکی تری دەکەیت.

گەیشتمەوە بارەگای خۆمان لە گوندی دۆڵەتوو.

سەرلەشکر لە ژێر دار گوێزێکا لەگەڵ باجی سەعدی و کۆمەڵێ شۆڕشگێڕ دانیشتبوون. سەرلەشکر دەیگوت:

ئاخر باجی سەعدی ڕاستە تۆ دایکی شەهیدی و دەبێ چاومان لێت بێ، بەلام چۆن ئەبێ لە مانگێکا سێ جار بێی بۆ هاوکاری و یارمەتی وەرگرتن لە شۆڕش؟

باجی سەعدی دایکی شەهید سمکۆبوو، سمکۆ شۆڕشگێڕێکی خۆمان بوو لە سنووری گەرمیان، ئێواریەکیان لەگەڵ کۆمەڵێ شۆڕشگێڕ لە ڕووباری ئاوەسپی ناوچەی بنارگل لە باکوری شاری کەرکوك نیازی پەرینەوەمان هەبوو، گەیشتینە ناوەڕاست ئاوەکە، هەر شۆڕشگێڕێك چەند هەنگاو لەوی تر دوور بوو، ئاوەکە زۆر قووڵ نەبوو، تا پشتینە دەهات، بەلام توند و بەهێز بوو، کەس نەیزانی سمکۆ چۆن پێی هەڵگلاو لە چاو ونبوو تا دۆزیمانەوە خنکا بوو.

باجی سەعدی وتی:

. نەوەڵا قوربان ئەمە لەم مانگەیا دوو جارە بێم.

+ کچێ باجی سەعدی وەڵاهی ئەمە سییەم جارتە..

باجی سەعدی هەر دانی پیا نەنا. ناچار سەرلەشکر وتی:

+ ئێستا باجی سەعدی سەلام و عەلەیکوم.

– کوڕە هەزار جار عەلەیکە سەلام.

+ باجی سەعدی! شەشی مانگ نەهاتی بەوناونیشانەی دۆلمەکەت بۆمان کرد؟

–بەڵێ وابوو.

+ئێ.. ڕەحمەت لە دایك و باوکت.

جاری دووەم پانزەی مانگ نەهاتی لە ژێر ئەو دارتووە دانیشتبووین بەو ناونیشانەی بە عەبەی چایچیم وت، عەبە هەڵسە چاییەك بۆ باجی سەعدی لێنێ، عەبە هەڵسا و ترەکەی لێدا؟

عەبە لەولاوە هەڵیدایە وتی:

– بەرەوەڵا وابوو باجی سەعدی.

– ئەمەش ئێستا بیست و هەشتی مانگە و سێیەم جارە هاتووی.

باجی سەعدی هاتنی سێیەم جاری پێ سەلمێندرا و ورتەی لێ بڕا. بەڵام ئەمجارەش نائومێد نەکراو هاوکارییەکیان کرد.

کۆڕی میوانداری باجی سەعیدیم جێ هێشت و هاتمەوە بەرەو ژوورەکەی خۆم.

مام حەسەن لەبەردەم ژوورەکەما دانیشتبوو چەتاڵی لقەدارێکی خستبووە بەینی هەردوو پێی ولاستیك و ناوکەفی لێ توند دەکرد، بۆ دروست کردنی دار لاستیك.

مام حەسەن شۆڕشگێڕێکی بەساڵاچووی سەرتاس بوو، لە دوو ددان بەولاوە لە دەمیا نەمابوو، لەوەتای بارەگامان چووبووە گوندی دۆڵە توو کڵاو و جامانەکەی فڕێ دابوو، سەرە بێ مووەکەی بەرەڵای ناو ئەو چەم و دۆڵ و بێشەیە کردبوو، ئەو لە ناوچەی هەولێر گەورە ببوو، وتم:

+ مام حەسەن! ئەو دار لاستیکە بۆکێ دروست ئەکەی؟

ـ وەڵا لۆ خۆم دکتۆر گیان، ئێستا دەچم کێشکەتان لۆ دەکوشمەوە، نیوەڕۆانێ دەحوەتی کێشکەتان دەکەم، سەبرم لێ گرن دەبێ پڕ بەیەک پەقرەچ کێشکەی بکوشم، دانی ئێوارێ کێشکەی دەخۆین.

+ کوڕە مام حەسەن پیاوی چاکبە کێشکەی چی؟ کەی تۆ لەو تەمەنەدا ماوی بەردە فڕکێ بکەی؟

ـ لۆ دکتۆر؟ لۆ نارێی توانای کێشکە کوشتنت نەمایە؟

گوێی نەدایە قسەکانی من و سەرەوخوار ملی نا بەرەو چەم و بێشەو ژێر دارگوێزەکان.

ئەوەنـدەی پـێ نەچـوو چـەند پیـاوێکی ئـاوایی دەسـتی منداڵێکیان گرتبوو بەرەو لای ئێمە ئەهاتن، منداڵەکە سەری شکا بوو، خوێن بەباڵایا دەهاتە خوارەوە، زەلامەکان بۆڵە بۆڵ و هەڕەشەیان ئەکرد، گەیشتنە بەردەرگای ژوورەکەی من بۆ تیمار کردنی سەری منداڵەکەیان، یەکێکیان پێ دەچوو باوکی منداڵەکە بێت، رووی کردە سەر لەشکرەکەمان وتی:

+کەی ئەمە راستە قوربان، ئێمە ئەم هەموو حورمەتەی لە ئێوە و شۆڕشگێڕەکانتانی ئەگرین، ئەمە قەرەبووی ڕێزگرتنەکە بوو لێمان گیرا؟

– چییە.. خاڵە چی بووە.

+ چی بووە؟ ئینجا چی ماوە ببێ، ئەوە نییە شۆڕشگێڕێکی ئێوە سەری کوڕەکەی شکاندووە؟

– شۆڕشگێڕی ئێمە؟ بۆ؟ لەکوێ؟

+ وەڵا چوزانم بۆچی؟ هەر لێرە لە خوار ئاوایی.

سەر لەشکر زۆر پەست بوو لەو کردارە، ڕووی کردە ژووری شۆڕشگێڕەکان و نەڕاندی:

– فەتحوڵڵا !! مام هێرش!! ئادەی یەکێکتان وەرن بچن بزانن کێ سەری ئەم منداڵەی شکاندووە؟ هەر ئێستا بۆم بێنن بۆ ئێرە.

ئێمە دەمانزانی مام حەسەنی کێشکەکوژە، بەڵام هیچ پاساوێك نەبوو بۆ ئەو کارە، چونکە سەری منداڵەکە شایەتی ڕاستیەکەی دەدا.

سەری منداڵەکەم تیمار کرد و لەگەڵ مام هێرشا بەرەو خوار بووین بۆ ناو چەم و بێشە و تووڕکەکان بە دوای مام حەسەنا، بە وردی لە چەمەکەیا بۆی دەگەڕاین.. دەنگێك لە سوچێکی ژێر بنجە تورکەکانا بە چپە بانگی دەکرد.

– مام هێرش..! مام هێرش..!، نزیك بووینەوە مام حەسەن بوو.

+مام حەسەن ئەوە چی ئەکەیت لێرە؟!

– کوڕە مام هێرش کاتێ بەردم دەهاویشتن لۆ کێشکەی سەردارەکە، وا بزانم سەری مندارەکم شکاندیە.

+ کورە مام حەسەن وابزانی چی! ئەرەوەڵا وات شکاندووە، داکی خێویت داوە بەگانا. هەستە ئەوە سەرلەشکر داوای تۆ ئەکا!

– لۆ شکاتیان لێ کردیمە؟ ئێ باشە ئێستا چ بکەم، بەخودا چاك عەیاو ئابڕووم چوو، منیش وتم:

+ نا حەیات ناچێ ئێوارە یەك پەقرەچ کێشەی دەخۆین.

مام حەسەنمان گەیاندە بارەگا و دار لاستیکەکەی لە پشتی خۆیەوە ڕاگرتبوو لەبەردەم سەرلەشکرا وەستابوو ئەیوت:

بەخودا قوربان ئەمن لۆ ئەوم نەهاویشت لە دەستم دەرچوو، ڕووداوەکە بوو بە پێکەنین و بەزمی شۆڕشگێڕەکان.

+ مام حەسەن! ئەو دار لاستیکە بۆکێ دروست ئەکەی؟

. وەڵا لۆ خۆم دکتۆر گیان، ئێستا دەچم کێشکەتان لۆ دەکوشمەوە، نیوەڕۆانێ دەحوەتی کێشکەتان دەکەم، سەبرم لێ گرن دەبێ پڕ بەیەك پەقرەچ کێشکەی بکوشم، دانی ئێواریێ کێشکەی دەخۆین.

+ کوڕە مام حەسەن پیاوی چاکبە کێشکەی چی؟ کەی تۆ لەو تەمەنەدا ماوی بەردە فڕکێ بکەی؟

ـ لۆ دکتۆر؟ لۆ نارێی توانای کێشکە کوشتنت نەمایە؟

گوێی نەدایە قسەکانی من و سەرەوخوار ملی نا بەرەو چەم و بێشەو ژێر دارگوێزەکان.

ئەوەنــدەی پــێ نەچــوو چــەند پیــاوێکی ئــاوایی دەســتی منداڵێکیان گرتبوو بەرەو لای ئێمە ئەهاتن، منداڵەکە سەری شکا بوو، خوێن بەبالآیا دەهاتە خوارەوە، زەلامەکان بۆڵە بۆڵ و هەڕەشەیان ئەکرد، گەیشتنە بەردەرگای ژوورەکەی من بۆ تیمار کردنی سەری منداڵەکەیان، یەکێکیان پێ دەچوو باوکی منداڵەکە بێت، رووی کردە سەر لەشکرەکەمان وتی:

+کەی ئەمە راستە قوربان، ئێمە ئەم هەموو حورمەتەی لە ئێوە و شۆڕشگێڕەکانتانی ئەگرین، ئەمە قەرەبووی ڕێزگرتنەکە بوو لێمان گیرا؟

− چییە.. خاڵە چی بووە.

+ چی بووە؟ ئینجا چی ماوە ببێ، ئەوە نییە شۆڕشگێڕێکی ئێوە سەری کوڕەکەی شکاندووە؟

− شۆڕشگێڕی ئێمە؟ بۆ؟ لەکوێ؟

+ وەڵا چوزانم بۆچی؟ هەر لێرە لە خوار ئاوایی.

سەر لەشکر زۆر پەست بوو لەو کردارە، ڕووی کردە ژووری شۆڕشگێڕەکان و نەڕاندی:

– فەتحوڵڵا !! مام هێرش!! ئادەی یەکێکتان وەرن بچن بزانن کێ سەری ئەم منداڵەی شکاندووە؟ هەر ئێستا بۆم بێنن بۆ ئێرە.

ئێمە دەمانزانی مام حەسەنی کێشکەکوژە، بەڵام هیچ پاساوێك نەبوو بۆ ئەو کارە، چونکە سەری منداڵەکە شایەتی ڕاستیەکەی دەدا.

سەری منداڵەکەم تیمار کرد و لەگەڵ مام هێرشا بەرەو خوار بووین بۆ ناو چەم و بێشە و تورکەکان بە دوای مام حەسەنا، بە وردی لە چەمەکەیا بۆی دەگەڕاین.. دەنگێك لە سوچێکی ژێر بنجە تورکەکانا بە چپە بانگی دەکرد.

– مام هێرش..! مام هێرش..!، نزیك بووینەوە مام حەسەن بوو.

+مام حەسەن ئەوە چی ئەکەیت لێرە؟!

– کورە مام هێرش کاتێ بەردم دەهاویشتن لۆ کێشکەی سەردارەکە، وا بزانم سەری مندارەکم شکاندیە.

+ کورە مام حەسەن وابزانی چی! ئەرەوەڵا وات شکاندووە، داکی خێویت داوە بەگانا. هەستە ئەوە سەرلەشکر داوای تۆ ئەکا!

– لۆ شکاتیان لێ کردیمە؟ ئێ باشە ئێستا چ بکەم، بەخودا چاك عەیاو ئابڕووم چوو، منیش وتم:

+ نا حەیات ناچێ ئێوارە یەك پەقرەچ کێشەی دەخۆین.

مام حەسەنمان گەیاندە بارەگا و دار لاستیکەکەی لە پشتی خۆیەوە ڕاگرتبوو لەبەردەم سەرلەشکرا وەستابوو ئەیوت:

بەخودا قوربان ئەمن لۆ ئەوم نەهاویشت لە دەستم دەرچوو، ڕووداوەکە بوو بە پێکەنین و بەزمی شۆڕشگێڕەکان.

# -١٣ -

دەمەو ئێوارە نازم هات بۆ بارەگاکەمان و لە ژوورەکەی لای من لایدا. من خەریکی دەم دانی سۆبا دارییەکەی ناوەڕاستی ژوورەکەم بووم.

کاک نازم یەکێك بوو لە شۆڕشگێرەکان، ئەو بالاّبەرزێکی گەنم ڕەنگی بە شەوکەت بوو، خاڵێکی سەوز لەسەر ڕوومەتی و خەنجەرێك لەسەر دەستی کوترا بوو، بەڵام بە تەواوی نەمدەزانی سەر بە چ گروپ و لایەنێکی سیاسی یە، هەر کاتێکیش لێم دەپرسی تا ڕاستیەکەی بزانم، ئەو لە پرسیارەکانم هەڵدەهات و قسەکانی دەگۆڕی بەلایەکی تردا، لە بارەگای هەموو گروپە سیاسەکانیش وەکویەك ڕێزی لێ دەگیرا. ڕێزێکی شان بەشانی بەرپرس و سەر لە شکرەکان !. دەمزانی تایبەتمەندیەکی ئەوتۆی هەیە و گرنگیەکی باشی پێ ئەدرێ، بەڵام نەمدەزانی بۆچی و هۆی چییە ؟

ئەو ئێوارەیە هاولاّتی یەك هەندێ ماسی بە چاك کراوی بۆ هێنا بووم. منیش بەترش و خوێوە سەنگ و بەردەم کرد بوو، هێنامە بەردەست و لەگەڵ کاك نازمدا پێکەوە سوورمان کردەوە، پاش نان خواردن، لە دوو پەرداخا دوو چایم تێکرد، ئەو چایەکەی ڕاکێشایە بەردەم خۆی و دوو سەرینی خستە ژێر باڵی و لابەلا لەسەریان پاڵی دایەوە و جگەرەیەکی داگیرساند.

ماوەی دوو ساڵ بوو ناوی ئەوم بیستبوو، بەلام تەنها ساڵێك بوو لە نزیکەوە دەمناسی.

ئەمجارەیان خۆم ئامادەکردبوو بەشێوەیەکی تر بۆ دواجار هەوڵ بدەم و بزانم ئەرکی شۆڕشگێڕانەی ئەو چی یە؟ چونکە ئەو لەگەڵ هیچ دەستە شۆڕشگێڕێك تێکەڵ نەدەبوو، پێشتر چەند نمونەیەکی لابەلام بۆ هێنایەوە و چەند سەرەداوێکی زیاترم دایە دەست کاك نازم. لە قسەکاندا ئەوپتر باسی لە تۆڵەکردنەوە دەکرد، لە دژی حکومەت منیش هاوشانی ئەو پێم لەسەر باوەڕەکانی دائەگرت پاشان وتم:

+ کاك نازم

-بەڵێ

+ئینجا با ئێمە هەر بیر لە تۆڵە بکەینەوە کە ئێمە هەمیشە هیواکانمان خەونی نەزۆك بن بە چی ئەچێت.

ئەو پێی خۆش نەبوو من تۆڵەکردنەوە بەخەون بزانم بۆیە وتی:

- دکتۆر بەڵێنم پێ ئەدەی ئەمشەو باسی هەرچیمان کرد سبەینێ کە لە خەو هەڵساین وای دابنێین کە هەموو قسەکانمان لە بیرکردووە و نهێنی بێت و لە بەینی خۆمانا بمێنێتەوە؟

+ بەڵێ بەڵێنت پێ ئەدەم.

جگەرەیەکی تری داگیرساند و لەسەرپشت ڕاکشاو مەچەکی دەستی خستە بەینی پشتی سەری و دیوارەکەوە، مژێکی درێژی لە جگەرەکەی داو وتی:

-کە منداڵ بووم لە شاری کەرکوك قوتابی بووم.

لەگەڵ قسەکردنا دووکەڵی جگەرەکە ئەهاتە دەرەوە.

هەمیشە بیرم لە جیاوازی نەتەوایەتی دەکردەوە، هەر چەند هەوڵم ئەدا بەیەك چاو تەماشای هەموو مرۆڤەکان بکەم و تووشی بیرکردنەوەی ڕەگەز پەرستیانە نەبم، کەچی کردارەکانی پیاوانی دار و دەستەی حکومەت دژی هاوڵاتیانی کورد و بە چاوی گومانەوە تەماشاکردنی کوردەکان ژەم بە ژەم لە مێشکمدا ڕەنگیان دەدایەوە، تەنانەت فەرمانی مامۆستاکانیشم بە فەرمانی حکومەت لە قەڵەم دەدا و دژیان دەوەستام، ئیتر نازانم لەسەر حەق بووم یانا ؟. ئەوانیش دژی کردارەکانی من دەوەستان و لە هەموولایەکەوە فشارم بۆ دەهات، تا وردە وردە تەواوی ڕاستی یەکان و چاکە و خراپەم تێکەڵ کرد بەسەر یەکا و لە هیچ کردارێك نەدەگەڕامەوە، من دانی پیا ئەنێم کە کۆمەڵی کردار هەبوون نەدەبوو بمکردایە، بەڵام بە بیری منداڵانە دەمگوت، هەموو کردارێکی تورەکەر و قێزەون دژی حکومەتە و لێی ڕانەدەوەستام.

وەکو ئێستا لەبیرمە ڕۆژێکیان چوومە سەرگومەتی گەرماوەکەی گەڕەکی بلاخ لە کەرکووك وەك تۆڵەیەك بۆ تەماشاکردنی لەشی خێزانی ئەو ئەفسەرەی کە لە گرتوخانە باوکمی دارکاری دەکرد، چونکە بینیم بە بوخچەیەکەوە خۆی کرد بە گەرماوەکەیا، بۆیە هەڵم کوتایە سەر گەرماوەکە، کەچی گیرام و دارکاریەکی چاك کرام.

لەبیرمە ڕۆژێکیان پۆلیسێك قازێکی کڕی، تا پارەکەی بۆ کابرا ژمارد من قازەکەم ڕفاند و ڕام کرد، کەچی ئەو کەوتە شوێنما و لەسەربانی ماڵێکا دەسگیری کردم و قازەکەی لێم سەندەوە و چەند ڕۆژ لە پۆلیسخانە دارکاری کرام

ورده ورده لـه قسەکانیا بـۆم دەرکـەوت کـه ئەمـه هەرنازەکـەی ڕۆژانـی قوتابخانەیـه کـه پەنجـەرەی دەشـکان و بەکـەر دەهـات بـۆ قوتابخانه. ئەمه هەر نازەی ناو فلیمی سینەما تەنەکەکەی قالەی برامه که قازەکه بەبن باڵیەوه بوو و ڕای دەکرد.

بەڵام من بێدەنگ گوێم لـه قسەکانی ڕادەگرت و ئەوەندەی تر بۆی دەسووتام، ئاگام لـه نیوه پەرداخەچایەکەی دەستم بڕا بوو، وەك دەمی مردوو سارد ببوەوه.

باسەکانی گەیشته ناوەڕاستی ساڵانی هەشتاکان و درێـژەی به قسەکانی دا وتی :

- بـه سـەربازی یـەدەك گـیرام و هـەر لـه کـەرکوك لـه بارەگـای سوپای یـەکی سـەربەهێزی کۆمانـدۆ بـووم، هـەمان کـات سـەر بـه هێڵـه نهێنی یەکانی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردستان بووم ئیشێ و کاری ڕێکخستنی نهێنینم دەکرد، پتر لە پـەنجا سـەربازی کوردم لـه ڕیزەکانی شـۆڕش ڕێکخـستبوو، کەچـی نـازانم بـه چ هۆیەکـەوه دوو لـه سـەربازه شۆرشـگێرەکان دەسـگیرکران ؟. پاشـان وەك زریـزه بیـستیان گـیرا، هەمووشیان دانیان به کرداری سیاسیانەی خۆیاندا نابوو هەمووشیان، منیان وەك بەرپرسی خۆیان ناوبردبوو.

مـن دەسگیر کـرام، کـار لـەوەیا نـەمابوو، دان بـه تـاوانی خۆمـدا بنێم یان نا، خرامـه ژوورێکـی تـەنیا و چاوەڕوانی فـەرمانی گولله باران کردنی خۆم بووم له بەغداوه بگەڕێتەوه.

ڕۆژانـەش سـوتاندنی لەشم بـه ئوتـوی کارەبـایی و پاشـانیش، دەیانهێنامـه دەرەوه بـۆ شـۆرینی مەنجـەڵ و کەرەسـتەی چێـشتخانه، هەرچەند ئەوه کردارێکی قەدەغەبوو کـه مـن بێمـه دەرەوه و ئیش و کار

بکەم، بەلاّم سەربازە پاسەوانەکان نەیاندەزانی من لەسەر چی بەند کراوم و نەشیان دەزانی کە کوردم و بەعارەبیان دەزانیم.

لەبەر تەمەڵی و خۆ دوور خستنەوە لە مەنجەڵ شۆرینیش کارەکەیان بەمن دەکرد، من ئەو کارپێکردنەم پێخۆش بوو، لە هەلێك دەگەڕام کە بۆی دەرچم و هەڵبێم، تا ڕۆژێکیان بە جل و بەرگە شڕۆڵە سەربازی یە خوێناوی یکەی بەرمەوە، دەریان هێنامە دەرەوە، بۆ شۆرینی کەرەستەی چێشتخانە، جلەکانم لە چەندین شوێنەوە نوسابوون بە برین و پێستی لەشمەوە کە لەژێر ئەشکەنجەیا ئاوەزەڵەیان کردبوو پێشتر لە کەلاوەی چێشتخانەکەیا تاکە چەکمەیەکم دۆزیبووە و ئامادەم کردبوو، بەو بێحاڵی و شڕۆڵییەوە چوومەلای پاسەوانەکە و داوای بەرگێکی سەربازیم لێکردکە لەبەری بکەم و ئەم جل و بەرگەی بەرم بشۆرم تاوشك ئەبنەوە و پاشان بەرگەکەی پیٚ بدەمەوە. ئەویش دڵی بە حاڵم سووتاو بەرگێکی بەڵەکی ئوتوکراوی بۆ هێنام، بەلاّم نەموێرا داوای کلاّوی لیٚ بکەم نەك هەست بکا مەرامێکم هەیە، داوایشم بکردایە ئەیوت :

تۆ بەندی کلاوت بۆچی یە؟ ناچار خێرا بەرگە پاکەکەم پۆشی وئیشاعە کۆنێکم لە هەندیٚ کاغەز پێچا و هەندیٚ پەڕۆی سپیم لە پێی چەپم ئالاّند و تاکە دەمپاییەکم کردە سەرپیٚ ولە پشتی چێشتخانەکە تاکە چەکمەکەشم کردە پێی ڕاستم و فرسەتم هێناو لە دیوارەکەی پشت چێشتخانەوە خۆم هەڵدایە ئەودیوەوە، ئیشاعە و کاغەزە لوول کراوەکەم بەدەستەوەبوو وردە وردە دوور کەوتمەوە. جار و بار ئۆتۆمبیلی ئەفسەرەکان بەرەو ڕووم ئەهاتن، منیش کەمێك سەرم دائەخست و بۆی ئەشەلیم تا بە سەربازێکی بیماری ڕێگای

نەخۆشـخانەی سـەربازیم بـزانن، لـە دەرگـای گـشتی سـوپاوە هاتمـە دەرەوە، بە پەلە تاکسیەکم گرت و دەرباز بووم.

کەرکوکم بـەجیٚ هێشت و خـۆم گەیانـدە ناوچەی شارەزوور و لـەویٚ نـاوی خـۆم گـۆڕی و بـەناوێکی تـر لـە پـەنای هەنـدیٚ دۆسـت و ناسیاو خۆم ون کرد ئەوان چەکداری حکومەت بوون، ناسنامەیەکیان بۆمنیش کرد بە ناوە دروست کراوەکەمەوە، پاش کەمتر لە سالێك، ڕۆژێکیان لەگەلٚ دوو هاورێی خۆمدا نیازی چوونە هەولێرمان هەبوو، بانگهێشت کرابووین بۆ سەر زەماوەند، سواری ئۆتۆمبیل بووین لە سلێمانیەوە بـۆ هـەولێر گەیـشتینە بازگـەی تاسلوجە، سـەربازە کـلاو سوورەکە ڕایگرتین. هاتە پێشەوە و کەمیٚ خۆی چەماندەوە و دەستی گرت بە ناو دەرگای لای شوفێرەکەیا و ملی هێنایە ژوورەوە وتی:

ناسنامەکانی هەمووتان، ناسنامەکانی وەرگرت و ڕۆیشت.

پاش کەمێك گەڕایەوە وتی:

ئۆتۆمبێلەکە لەسەر ڕێگاکە لادەن و بیهێننە ئەملاوە، خۆشتان دابەزن و وەرنە ئەم ژوورەوە، خۆم و دوو هاوڕێکەم و شوفێرەکە خراینە ژوورێکی بچوکەوە، بیٚ ئەوەی بزانین چیمان کردووە؟.

ئەوەندەی پیٚ نەچوو ئۆتۆمبیلێکی جام تاریك هات و من و دوو هاورێکەم، بە چاوی بەستراوەوە سەرخراین و شوفێرەکەیان بەرەلاٚ کرد، چاوی من زۆر توند بەسترا بوو تۆپی چاوەکانم خەریك بوون دەرپەڕین، لە هاورێکانم پرسی:

– چاوی ئێوەش واتوند بەستراوە؟ من خەریکە چاوم دەرئەپەری؟

دەستێك كێشای بەناو دەمما شلّپەی لە دەم و پلم

هەلّسان، یەكێ لەسەربازەكان بوو، وتی:

– ورتەت لێ بێ زمانت دەربڕم !..

من لە ڕێبازی سیاسیانەیا هیچ پەیوەندیەكم بە دووهاورێ كەمەوە نەبوو. گەیشتینە هەوالّگری گشتی سلێمانی، هاوڕێكانم بە چاوی بەستراوەوە خرانە دوو ژووری بچوكەوە، بەلاّم پاش كەمێك چاوی منیان كردەوە ولە حەوشەكەیا ڕاینگرتم، منیش لە كنار باخچەكەیا دانیشتم و هەردووپێم شۆڕكردەوە ناوچیمەنەكە، پاش نیوكاتژمێر، لەپرشەقەی پێی ئیشكگری بەردەرگاكە هەلّساو شلّپەی پیاكێشانی سەر قۆناخی تفەنگەكەی هات و پێشوازی لە ئەفسەرێكی پایەبەرز كرد، من زۆر گوێم نەدایە ئەو جولاّنەوەیە، لە خەیالّی ئەوە دابووم كە، دەبێ سیخوڕان ناسنامە دروست كراوەكەمیان ئاشكرا نەكردبێ بۆ حكومەت؟!.

سەرم داخستبوو بەپشكۆی جگەرەكەم یەكەیەكە نوكی گیای چیمەنەكەم هەلّدەقرچان، وردە وردە هەنگاوی ئەفسەرە چەكمە سوورەكە لێم نزیك بووەوە و لە ئاستی مندا وەستا لابەلا سەرم بۆ هەلّبڕی، دەم و چاوی ئەفسەری بەڕێوەبەری فەرماندەی هەوالّگری سوپای یەكی كەركوك بوو كە بە دەستی خۆی ئوتوی گەرمی بە پشتمدا ئەهێنا، ئەو بەر لە بەندكردنی جاری پێشووشەوە لە نزیكەوە منی دەناسی و وەكو هاورێ یەك بوو لە گەلّما بێ ئەوەی هیچ بلّێت ڕووی كرد بەولایا و چووە ژوورەوە ئەوەندەی یەك و دوو پاسەوانێك هات بە شوێنما و كەوتمە پێشی بۆ ژووری بەڕێوەبەری گشتی هەوالّگری، فەرماندەی بە خوێن تینووی پێشووم لەوێ دانیشتبوو، وەك

تاوانبـارێکی جـەنگ بەرامبـەریان وەسـتام بـێ ئـەوەی بەڕێوەبـەر هـیچ بڵێت، فەرماندەی پێشووم ڕووی کردە بەڕێوەبەر و وتی:
+ئەمە کێ یە و لەسەرچی گیراوە؟
بەرێوبەر ووتی:
-ئەمـە هـاولاتی یەکـە لەگـەڵ دوو تاوانبـاردا گـیراوە، ئێمـە مەبەسـتمان گرتنـی ئـەو دوو تاوانبـارە بـووە کـە ناوەکانیانمـان دابوونـە بازگـەکان، بەلاّم ئەم تەنها لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەوان بووە هاتووەتە ئێرە، نیازمان وایە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەین ئەگەر دەستی لەگـەڵ ئەواندا نـەبێت و هاورێ ی سیاسیانەی ئەوان نەبێت ئەوا ئازادی ئەکەین.
فەرماندە قسەکانی پێبڕی:
-کوڕە ئـەوە تـۆ ئـەڵی چـی؟ هاولاتی چـی؟ و لێکۆڵینـەوەی چـی؟ ئەمـە نـاوی ڕاسـتەقینەی نازمـە، نـازمی گێـرە شـێوێن و تاونبـاری سیاسـی و خائین بەشکۆداری دەوڵەت، نازمی هەلاّتوو لە ژێر ئەشکەنجە و فەرمانی گوللەباران کردن، من لە ئاسمان بۆ ئەمە دەگـەڕام و کەچی ئێوە لەسـەر زەوی گرتوتانە؟ من دووانەکەی تر بە بـێ تـاوان دائەنێم کە نـازانم چـی یـان کـردووە، بـەلاّم ئـەم ئـەبێ گوللـەباران بکرێـت، چـونکە فـەرمانی کوشتنی لە بەغداوە گەڕایەوە، بەلاّم ئەم هـەلاّت. ئێـستاش لەبـەر ئـەوەی دەسگیر کردنەوەی چالاّکی ئێوەیـە دەبـێ دووبارە داوای ڕەزامەنـدی لـە بەغدا بکەنەوە و بیگەیەننە دۆزەخ.

مـن ئـەم ڕەزامەنـدی بەغدایـەم بـەلاوە سـەیر بـوو چـونکە ڕۆژانـە ئاگاداری کوشتنی چەندین کورد بووم کە لە ژێـر ئەشـکەنجەیا دەمـردن، نازانم بۆچی کوشتنی من ڕەزامەندی بەغدای دەویست ؟. هەبێت و نەبێ

هۆیەکەی ئەوەبوو کە من سەربازێکی دەوڵەت بووم بۆیە سەربەخۆ ئەو کارەیان پێ نەدەکرا.

خرامە ژوورێکی یەك مەتریەوە و شایەتمانێکی بەهەقم هێنا و چاوەڕوانی مەرگی خۆم بووم.

لە ڕۆژی یەکەمەوە بەرنامەی ئەشکەنجەدانەکەم دەستی پێ کردەوە، هەمان ئەشکەنجەی ڕۆژانی بەندیخانەی هەواڵگەری سوپای یەك، پێش چوونە بەر هەر تاوە ئەشکەنجەیەك هۆشم بەخۆمەوە بوو، بەڵام نازانم چۆن بە بێ هۆشی دەیانهێنامەوە ژوورەیەك مەتریەکە و بەگرمۆڵەیی فڕێیان دەدام ؟، ئەوان منیان بە بێ پا لە قەڵەم دابوو، دەیانویست بەهۆی ئەشکەنجەوە من شتێك بدرکێنم و چەند پادارێکی تریان لە هێڵە نهێنیەکانی شۆڕشگێڕانی کورد دەسکەوێت. هیچ شتێکیان لە من نەدەشاردەوە چونکە باوەڕیان وابوو جارێکی تر من جیهانی کۆمەڵگا نابینمەوە.

چەند جارێك بە بەردەم ئەو دەزگا ئاسنەیا تێپەریان دەکردم کە ملی مرۆڤی دەقرتان، دەزگاکە لە دەزگای خشت برین دەچوو جامێکی پەنجا لیتری لەبەردەمیا بوو تاکەللەسەر و خوێناوەکەی تێبچێ، بەڵام خواوەند هێزێکی خۆڕاگری چاکی پێ بەخشیبووم، بۆ تەنها پیتێکیش سوودیان لە من وەرنەگرت.

ڕۆژی دوو جار مۆڵەتی سەرئاوم هەبوو جارێك بەیانی و جارێك ئێوارە. هەرجارە و پێنج تا دە خولەك پاسەوانەکەش لە بەر دەرگای ئاو دەسەکە هاتوچۆی دەکرد.

لوولەیەکی ئەستووری یەك مەتری پاشماوەی سیفۆنی ئاو دەستەکە لە بن دیوارەکە چەقیبوو. بۆ خۆی کەمێك دەلەقی و

هەرجارێکیش دەچوومە سەر ئاو ماوەی ئەو دەخولەکە بەم لاو ئەولایا تەکانم ئەدا، پاش دە ڕۆژ یاری کردن بە لوولەکە، لە پڕێکا لە بنا قرتا.

لوولەکەم لەگەڵ ڕانی ڕاستما جووت کرد و بەدۆخینی شەرواڵەکەم توند لەگەڵ کەمەرما شەتەکمدا، ئامادە بووم هەموو کارێك بکەم کە هۆکاری ڕزگاربوونم بێت، چونکە دەستم لە خۆم شۆریبوو.

دەستەکانم بە هەردوولای کەمەرمەوە گرت کە گوایە سکم ئێشێ، نەك لوولەکە بترازێ و لە دەرلنگی شەرواڵەکەمەوە بێتە خوارەوە، لە ئاودەست هاتمە دەر و کەتمە پێش کابرای پاسەوان و گەیشتمە ژوورەکەی خۆم، پاسەوان دەرگای لەسەر داخستم و بە دەنگی پێیەکانیا هەستم بە دوور کەوتنەوەی کرد، لوولەکەم لە گۆشە بۆ گۆشە درێژ کرد بە قەد ژوورەکەم بوو، پەتووە شڕەکەمدا بەسەریا.

ڕۆژی دوایی کارگوزاری بەندیخانە بەدەم گسك دان و خاوێن کردنی زەوییەوە پەیتا پەیتا جنێوی ئەدا، ئەوەی دەیگوت نەیدەوتەوە، دایکی گەورە و بچوکی دەزگا خوێن ڕێژەکەی دەگا. زۆر تورە و قەڵس بوو. ئەو کابرایەکی عارەب بوو لەگەڵ مندا زۆر ڕوو خۆش بوو، ڕۆژانە کە دەگەیشتە بەر دەرگای ژوورەکەم تاوێکی چاك دەمەتەقێ وقسەی لەگەڵ دەکردم و ئەحواڵی ئەپرسیم، ئەو نەیدەزانی بۆچی گیراوم و کوردیشم چونکە لە تاکە چاوێکم بەولاوە هیچ شوێنێکی تری نەدەدیم و نەیدەزانی لە ناو قەد بەرەو خوار شەرواڵێکی شاڵم لەبەردایە، هەمیشە دوعای ئازادبوونی بۆ دەکردم.

کە نزیك بووەوە لە ژوورەکەم پرسیم:

+ مام حاجی خێرە وا ئەمڕۆ پەست و نارەحەتی؟

– کوڕە پەستم بە دەست ئەم گەواد و کەم ڕەوشتانەوە! ئەوەتا، لەبەیانی یەوە کە خوا ڕۆژی کردووەتەوە ئەم فەرمانگە گەورە و گرانەیان بە تەنها بەسەر مندا جێ هێشتووە.

- ئەی خۆیان بۆ کوێ چوون مام حاجی؟

+ بێ شەرەفانە چوونە تەماشای شەرەف و نامووسی ئەو خەڵکە هەژارە بکەن، ئەمڕۆ ڕێ پێوانی قوتابیان و فەرمانگەکانە، نازانم لە یادی چی دایە ئەمانیش کەوتوونەتە سەر شەقامەکان بۆ تەماشاکردنی کچان؟

ئەم هەواڵەی کابرای کارگوزار نیوەی ئازاد بوون دڵ خۆشی کردم. هەر ئەوەندەم چاوەڕوان کرد کارگوزارەکە دوور کەوتەوە.

پیرە لوولەم دەرهێنا و لە شیشی ناوەڕاستی پەنجەرە بەرزەکەم توند کرد کە تەنها بستێك و قولانجێ بوو بەڕووکاری ئەودیوا، هەڵم تەکاند. ئەوەندەی یەك و دوو لەو کونە بەرزەوە خۆم ئاودیوو کرد دەلاقەکە زۆر تەنگ بوو، پێستی لەشم بەملاو ئەولای دەلاقەکەوە جێما.

لە دەلاقەکە بەو دیوا ئاستی سەربانی حەمامێك بوو، حەوشێکی چۆڵ هەموو ژوورەکان داخرا بوون، بەرەو دوا هەڵزنام بە دیواری ژووری بەندە تەنیاییەکانا لەسەربانی لای دەستە ڕاستەوە کە ئەیڕوانییە شەقامەکە، دوو سەبازی کڵاوسووری جل بەڵەك بەدیار مەترەلۆزێکەوە دانیشتبوون، پەنجا مەترێك لەمنەوە دوور بوون.

ئەوان لەبەر تەماشا کردنی کچان سەرقاڵی ڕووکاری شەقامەکە بوون و ئاگایان لە پشتەوە برا بوو، خۆم گەیاندە دیواری کۆتایی بەندیخانەکە و بە کۆڵانێکی تەنگە بەری دەرەوەی بەندیخانەکەیا خۆم شۆڕکردەوە و خۆم گەیاندە حەشاماتی چەپڵەکوتانی ڕێپێوانەکە.

هەوڵم ئەدا خۆم بگەیەنمە ئەوبەری شەقام، جل و بەرگی خوێناوی و وشك هەڵاتووم بەگیانمەوە نووسابوو. خەڵکەکە بە شێت و هاریان دەزانیم و لێم دوور دەکەتنەوە، منیش وەك ئەوان بەهەموو هێز چەپڵەم دەکوتا، نەمدەزانی ئەوان بۆچی چەپلە دەکوتن ؟، بەڵام بۆخۆم دەمزانی بۆچی چەپڵە لێدەدەم. چەپڵە لێدانی من بۆ خۆ ون کردن بوو نەك بکەومە بەر سەرنجی سیخوڕانی دەرەوەی حەشاماتەکە.

بەهەر حاڵ خۆم گەیاندە ئەوبەری شەقام و چوومە نزیك ترین ماڵە هاوڕێم، بەپرتاو خۆم کرد بە ژوورا، ئەو ئۆتۆمبیلێکی تاکسی هەبوو، هێشتا لە ماڵ نەچووبووە دەرەوە، بە حەپەساوی بەرەو ڕووم هات وتی:

+ نازم ئەوە چییە؟ ئەوە بۆ وات لێهاتووە؟

– ئێستا وەختی درێژەی قسەکردن نی یە، دەستێ جل و بەرگم بدەرێ و دەچمە حەمامەکە و هەندێ ئاو دەکەم بەسەر و لەشی خۆمدا، تۆش هەر ئێستا بڕۆ منداڵەکانم لە شارەزوور دەرباز بکە و بیانگەیەنەوە ناوچەیەکی ئازاد کراو.

+ ئاخر..

– ئاخری پێ ناوێ هیچ مەڵێ و سوار بە و بۆی دەرچۆ.

ئەو ڕۆیشت و منداڵەکانی رزگارکرد، منیش لە ڕێگایەکی ترەوە خۆم لەناو شار دەرباز کرد و گەیشتمە ناوچەی ئازاد کراو.

ماوەی یەك مانگ لە جێدا کەوتم. دکتۆری شۆڕشگێڕەکان برینەکانی لەشمیان تیمار دەکرد، لەوە بەدوا داوای دەمانچەیەکم لەسەر لەشکر کرد. من خولیای تۆڵە کردنەوە کەوتە سەرم، نەك تەنها تۆڵەی

خۆم، تۆڵەی ئەو هەموو هاوارەی لە قەسابخانەکەی ئەواندا کەڕیان دەکردم. سەر لەشکر دەیگوت:

+ جاریٚ پەلە مەکە ئەم کارانە بەپەلە ناکریٚن.

من سووربووم لەسەر گەڕانەوە بۆ ناو شار وتم:

– قوربان ئەگەر دەمانچەیشم بۆ دابین نەکەن، بەبیٚ چەکیش بیٚ هەر ئەڕۆم.

سەرلەشکر زانی ڕێگرتن بێسوودە لەگەڵ مندا، دەمانچەیەکی برۆنیکی چواردەخۆری تازەی پیٚ دام.

سبەی لەگەڵ تاریك و ڕوونا بۆی دەرچووم و خۆم گەیاندەوە سلێمانی.

مەرگ گیانێکی بیٚ هێز بوو لەبەردەم مندا، چونکە من دووجار لە سێدارە درام و هەر نەمردم، من کۆچ کردوویەك بووم و بە مۆڵەت گەڕابوومەوە ناو کۆمەڵ و لە خۆڕایی دەژیام. بڕیارمدا ببم بە خیۆ، ببم بە ئیزرائیل بۆپیاوانی خوێن مژی حکومەت. ئەوە بە تەنیا بڕیاری خۆم بوو، نەك بڕیاری هیچ لایەنێکی سیاسی کوردستان. هەقیشم بوو بەو جۆرە بیربکەمەوە، من لە منداڵیەوە هەر بیرم لە تۆڵە دەکردەوە، کەچی بە زۆری زۆرداری پێیان چزاندم بە ساجی گەرما و بەکردار خرامە سەر ئەو ڕێگایە و دەست بەکاربووم، بە جۆرێك خەیاڵ و ئارەزوو ویستی هەر کوردێکی ئازدیخوازم دەکرد بە ڕاستی و ڕووداوی ڕاستەوخۆ و زیندوو، هەڵبەتە هەندیٚ ناسنامەی دروستکراوم ئامادە کردبوو بە پلەی جۆراوجۆری ئەفسەری پایەبەرز چونکە نیازم وابوو کە بە بەرگی ئەفسەریەوەهەندیٚ لە کارەکانم ئەنجام بدەم.

یەکەم دەستە گوڵم جەللادەکەی خۆم بوو کە لە هەواڵگری سلێمانی لە ژووری چاوەڕوانی مەرگ دەری ئەهێنام و دەیخستمە ژێر ئەشکەنجە و ئوتوی گەرمەوە، ئەوکاتانەش دەنگی ئافرەت و کچ و کاڵی کورد کە لە ژێر ئەشکەنجە و دەسدرێژی کردنە سەریان هاواریان دەکرد دەهاتە گوێم و ئاگام لە لەشی خۆم دەبڕا ڕەگ و ماسولکە لە لەشمدا نەدەما تا درك بەو ئازارانە بکات.

سەر لەبەیانی بوو جەللادەکەم لەگەڵ هاوکارێکی خۆیدا لە بازارێکی نیمچە چۆڵدا ڕووبەڕووم هاتن، تەواو نزیك بوونەوە، ئەوپێشتر دەستی بۆ تەرەقەی دەمانچەکەی برد، نەمهێشت دەمانچەکە دەربێنێ بە فیشەکێك تەویلێم پێکا، هاوکارەکەی هەلات پاش دوور کەوتنەوەی چەند هەنگاوێك گازرایی پشتیم پێکا و هەردووکیانم بێگیان کرد،

سەرت نەیەشێنم دکتۆر لە ماوەی مانگێکا دوانزە جەللادم سەگ تۆپ کرد کە بەچاوی خۆم کردارەکانیانم لە بەندیخانەی هەواڵگری بینی بوو.

منیش بە هێمنی سەرم بۆ دەلەقاند. حەزم دەکرد ئەو شەوەم بە سالێك لێبڕوا، جگەرەیەکی تری داگیرساندو درێژەی پێدا.

– بێ دواکەوتن خۆم گەیاندە کەرکوك بۆ کوشتنی فەرماندەی بەخوێن تینووم لە هەواڵگری سەربازی کەرکوك، من زانیاری تەواوی هاتوچۆی ئەوم دەزانی. پاش دەست هەڵگرتنی لە کاری هەواڵگری سەربازگە.

ئەو لە کاتژمێر دووی نیوەڕۆ بە دواوە ئۆتۆمۆبێلەکەی لەو سەری بازاری قۆریە ڕادەگرت و بە پیادە شۆڕ دەبووەوە ناو بازاڕی

ماسـی فرۆشـان بـۆ کرینـی پێویـستیەکانی خـۆی، بازارەکـە سـەر لەبەیانیان و ئێواران زۆر قەرەباڵغ بوو بەڵام لە کاتژمێر یەك تا سێ ی پاش نیوەڕۆ هەندێ چۆڵتر دەبوو، ئەو کاتەی چاوەڕوانی ئەو بووم تاکە تاکەی دوکانەکان داخرا بوون، لەبەردەم دوکانێکی داخراو دانیشتم ڕووبەڕووی ئەو کۆڵانەی دەچووە لای سینەما حەمرا، جگەرەیەکم داگیرساند و چاوەڕوان بووم، شەروالێکی ڕەش و کراسێکی سپیم لەبەر دابوو دەمانچەکەم لە گیرفانی شەروالەکەیا لەسەر پێ دانا بوو، کاتژمێر گەیشتە دوو و هەندێك، فەرماندەکەم بە جلە بەڵەکەکەیەوە لە دوورەوە دەرکەوت ورگی بەسەر قایشە سەربازی یەکەیا شۆڕ ببووە، ڕووم تێ نەکرد تا گەیشتە نێوان سێ مەتر لە من. هەستامە سەرپێ و لەبەردەمیا وەستام دەمانچەکەم بە دەستی ڕاستم گرتبوو لە گیرفانی شەروالەکەیا ئەو لە جێگای خۆی ڕاوەستا و وشك هەڵات، پێیەکانی جووت و دەمی داچەقابوو، چاوی زەق کرد بووەوە و تەماشای دەکردم، نەیدەتوانی نەقسە بکات نەبگەڕێتەوە نەبێتە پێش، تەنها زمانی لەناو دەمیا بە ئاستەم دەلەرزی، ڕەنگی مردوو هات بەسەر ڕوخساریا، زۆر هێمنانە یەخەیم گرت و دەمانچەکەم دەرهێنا و خستمە سەر تەوێڵی، نازانم ڕووداوەکەی بە خەون دەزانی یان فریشتەکان تاساند بوویان ؟. لەگەڵ گوشینی پەلە پیتکەی دەمانچەکەیا لە پشتی سەریەوە مێشك پڕژا. لەسەر پشت کەوتە سەر زەوی، دەمانچەکەی و ناسنامەکەیم لێ کردەوە و لە کۆڵانەکەوە کەوتمە ڕێ بەرەو شەقامی سینەما حەمرا، لەوێ تاکسیەکم گرت و ڕۆیشتم.

ئیتر لەوە بەدوا پاراستنی گیانی خۆم لا مەبەست نەبوو من تۆڵەی خۆم بە زیادەوە کردەوە. ئیتر بێباك بووم لە مردن، بۆ ئەنجام

دانی هەر تۆڵەیەکی تر وەك ئاو خواردنەوە ڕووم تێ دەکرد، دەگەڕام بەشوێن زانیاری و ناسینی پلەداری تاوانبار و دەست خوێناوی یەکانی حکومەتدا، لەگەڵ دەست نیشان کردنی هەر تاوانبارێکا نەمدەهێشت تەمەنی درێژی چەند ڕۆژێ زیاتر بخایەنێت. زانیاریم سەربارەت بە ئەفسەرێکی پلەی سەرهەنگ دەست کەوت ئەو فەرماندە بوو لەسەر ئەو سوپا و ئامێرانەی کە ڕۆژانە هەڵیان دەکوتایە سەر چەند گوندێك و دەیانڕوخاند و کاولیان دەکرد.

ڕۆژێ ئۆتۆمبیلی تاوانبارم لەبەردەم چێشتخانەیەکا بینی لە سلێمانی ژمارەکەم ناسیەوە، خۆم کرد بە چێشتخانەکەیا، سەرهەنگ وەك مانگای مالوان خۆی دابوو بەسەر کورسی و مێزێکا خەریکی خواردنی مریشکێکی سوورەوە کراوبوو، لەوبەرەوە ڕووبەڕووی دانیشتم و چاوەڕوان بووم نانەکەی ژەهر بکات و دەرچێتە دەرەوە تا وەکو بەراز کوژی بکەم. ئەو پارووی دەگلان و منیش لە دڵی خۆکمدا قسەم لەگەڵ دەکرد، دەمگوت :

– ئەمە دوا نانتە لەسەر زەوی، چاك بخۆ.

نانی خوارد و بە چیلکەیەکی گوڵە خاشخاش کەوتە پاك کردنەوەی بەینی ددانەکانی، ئەو چوارشانەیەکی ڕەشتاڵەی ورگن بوو، لانێوو چەوانەکانی ڕووتاوە و دوو قات غەبغەبەی هاتبووە سەرسنگی، چاویلکەیەکی شووشە فۆتۆگرە و سەرشانی بەئەستێرەی پلە سەربازی یەکانی دەبریسکانەوە، چایەکی ڕەش و شیرینیان بۆ هێنا، لە دڵی خۆمدا دەمگوت :

– ئەمە دوا چاییتە خێرا هەڵیقوڕێنە.

هەڵسایە سەر پێ چووە سەر دەسشۆرەکە، منیش هەڵسام و چوومە تەنیشت ئۆتۆمۆبیلە بۆر، ئۆتۆمبیلێکی مۆدیل بەرزی شووشە تاریک بوو. ئەوەندەی پێ نەچوو هاتە دەرەوە، من زیاتر لە دەرگای پێشەوەی دیوی شوفێر نزیك بوومەوە، کاتێ بەتەنیشتما هەنگاوی نا بۆ کردنەوەی دەرگاکە کەمێك شانی لە شانی من خشا، مۆرەیەکی لێ کردم و بە نوکی پەنجەکانی شانی خۆی تەکاند، پێدەچوو شانی من بە گڵاو بزانێت، من نەمدەویست بەرلەوەی بچێتە ناو ئۆتۆمۆبێلەکەوە بیکوژم دەمگوت نەك لەو هەموو گیرفانەیا بە ئاسانی کلیلی ئۆتۆمۆبیلەکەم بۆ نەدۆزێتەوە، یا کێ دەڵێ ئەو ئۆتۆمۆبیلە ئەکەوێتە کار؟ چاکتر وابوو خۆی کلیلەکە دەربێنێ و دەرگا بکاتەوە و بچێتە ناو ئۆتۆمۆبیلەکەوە بیخاتە کار و ئامادەی بکات.

چاوەڕوانم کرد تا هاژەی ئۆتۆمۆبیلەکە هات، کە دەستی ڕاستی لە کلیلەکە بەردا دەستی چەپی بەسوکانەکەوە بوو، نەمهێشت دەستی ڕاستی بگەیەنێتە گێر و ئۆتۆمۆبیلەکە بجولێت، بە دەستی ڕاستم دەمانچەکەم دەرهێنا و بەدەستی چەپ دەرگاکەیم کردەوە فیشەکێکم نا بەکەللە سەریەوە، شانیم گرت و ڕامکێشا، کەچی دەستی لە سوکانەکە نەدەبووەوە، فیشەکێکی ترم نا بە ناو گوێچکەیا لە گوێچکەکەی تریەوە خوێن دەرپەری، ئەمجارەیان ڕامکێشا و هێنامە خوراەوە، بە پەلە دەمانچەکەی و ناسنامەکەیم، دەرهێنا، لەم کەین و بەینەیا خەڵکەکە هەریەکە و بەلایەکا هەڵدەهاتن و بووبە فرك و هوڕ خۆم هەڵدایە ناو ئۆتۆمۆبیلەکەوە. ئۆتۆمۆبیل هێشتا کاری دەکرد، گێڕم گۆڕی و بەوپەڕی خێرایی و بێ ڕاوەستان لە سلێمانیەوە بەرەو بازگەی عەربەت بۆی دەرچووم، خۆم گەیاندە ناوچەی ئازاد کراو.

پـاش ماوەیـەك ناونیـشانی سـیخوڕێکی بـەناو شۆڕشـگێڕم وەرگرت، ئەو کارێکی خۆ فرۆشانەی بەرامبەر بە گەل و شۆڕش ئەنجام دابـوو. دەسـتی وەردابـوو لـە خـوێنی سـێ شۆڕشـگێڕی هاوسـەنگەری خـۆی. دیـار بـوو هـەر لەسـەرتاوە بـۆ جێبـەجێ کردنـی ئـەو تاوانـە پەیوەندی بە شۆڕش کرد بوو.

سەرلە بەیانی یەکی دەمەو پایز خۆی و هـەر سێ شۆڕشگێری هاوخـەباتی پێکـەوە لەناوچـەی ئـازاد کـراوا مانـدووی ڕێگایـەکی دوور دەبن بۆ تاوێك پشوو لە دیار کانیـەکی بەر سێبەری کۆمـەڵێ درەختـی شـۆڕەبی ڕادەکـشێن سـێیان دەخـەون و جـەبار ئێـشکگر دەبێـت، ئـەو لاوێکی تەمەن بیست و پێنج ساڵ بوو، بە تفەنگەکەی دەستی هەر سـێ شۆڕشگێڕی هاوخـەباتی خـۆی لـە شـیرین خـەودا گوللـەباران ددکـات و پاشـانیش کوێـچکەکانیان دەبـڕێ و وەك دەسـتە گوڵێـك بـۆ حکومـەتی دەباتەوە بۆ چەمچەماڵ. لەگەڵ وەرگرتنی ناونیشانی تاوانبارا، بۆ تەنها شەوێکیش ئۆقرەم نەگرت خێرا خۆم گەیاندە شاری تکریـت، ئـەو لـەوێ خۆی شاردبووە، پلەی ئەفسەری ئاسایشی پـێ درا بـوو. هـەمان ڕۆژ لـە دەرگای ماڵەکەیانم داو هاتە دەرەوە بە عەرەبی پرسیم :

+کاك جەباری؟

–بەڵێ

+ ئەکرێ ناسنامەکەت ببینم؟

ناسنامەی دەرهێنـا و دایـە دەسـتم، بـۆم دەرکـەوت کـە خۆیـەتی دەمانچەم دەرهێنا و سێ فیشەکم نایە ناو دەمیەوە، لە پشتی سـەریەوە کەللەیم تەقاند.

پاش ماوەیەکی کەم ناونیشانی ئەفسەرێکی سیٚ ئەستێرەی هەواڵگریم وەرگرت، ئەو نەقیب دەحامیان پیٚ دەگوت، شوفێری تاکسی بوو لە کەرکووك، تاکسی یەکەی تەنها وەك تەڵە بەکار ئەهێنا بۆ ڕاوکردنی ئەو لاوە کوردانەی لایەنگری ڕێبازی کوردایەتین. لەگەڵ سوارکردنی هەر لاوێکی کوردا، بۆخۆی دەستی دەکردە جنێودان و ناڕەزایی دەربڕین لە دەست ڕژێمی عێراق و سەرۆکی عێراق، هەر کە لاوە کوردەکە بیگوتیایە وەڵاّ ڕاست ئەکەی! ئەو دەیگوت :

بەیارمەتیت ئیشێکی بچوکم هەیە و پاشان دەتگەیەنمە جێگای مەبەست لاوەکەی دەگەیاندە نزیکترین فەرمانگەی ئاسایش یا پۆلیس و پاشان ملیان دەکرد بە پەتا.

بە دەیان لاوی گەیاند بووە پەتی سێدارە، ژمارەی تاکسیەکەیم وەرگرت لەگەڵ ناوی خۆیدا، ماوەی سیٚ ڕۆژ وەکو پۆلیسی هات و چۆ لەبەر قرچەی هەتاوی بازارەکانی کەرکوك هاتوچۆم دەکرد، چاوم بۆ ئەو ژمارەیە دەگێڕا.

دوو جار تووشی تاکسیەکەی بووم بەلاّم خەڵکی تری سوار کردبوو، نە دەکرا دەستی لیٚ ڕاگرم، بۆ جاری سێیەم تووشم بوو کەسی تیا نەبوو، دەستم لیٚ ڕاگرت و سواری کردم وتی :

–فەرموو دەچیٚتە کویٚ؟

+دەمەویٚ بچمە داقوق.

– کریٚ کەی چوار دینار دەکا

+ زۆر نی یە؟

– با سیٚ بیٚ.

+ باشە.

کەوتــە ڕێ، بــە هــەمان شــێوە بــوو کــە باســی لێ دەکــرا، ئــەو دیشداشەیەکی سپی لەبەردا بوو پیاوێکی بەهەیکەلی بالاّ بەرز بوو. بە عــارەبی دەســتی کــردە جنێــودان بــە ســەرۆکی عێــراق و ڕژێمەکــەی، مــن ورتــەم لێــوە نــەهات تــا لــە بازگــەی خــوار کــەرکوك تێپــەر بــووین ڕووە و بەغدا، ئەو ڕۆژە نێزە تفەنگێکم لەگەڵ دەمانچەکەیا خستبووە گیرفانی شەرواڵەکەم.

تەواو لە شار دوورکەتینەوە، دەستم لە گیرفانی شەرواڵەکەیا بوو دەسکی نێزەکەم توند گرتبوو وتم :

+ تۆ نەقیب دەحام نیت؟

بە پەلە دەستی کردە باخەڵیا، نەمهێشت دەستی بێنێتە دەر، نێزەکـەم چـەقاند بـە ژێـر قوڕگیـا و لـە ژێـر گوێـچکەی لـەو لاوە هاتـە دەرەوە. تێزەکـەم لـە قوڕگیـا جـێ هێـشت و دەسـتم گـرت بە سـوکانی ئۆتۆمۆبیلەکـەوە تـا وەرنەگـەڕێت، ئـەو کەوتـە لرخـە لـرخ، وردە وردە ئۆتۆمۆبیلەکـەم هێـواش کـردەوە و لـە ڕێگـای گـشتی دوورم خـستەوە. کەلاکەکـەیم فـڕێ دایـە خـوارەوە و ناسـنامە و دەمانـچەکەی باخـەڵیم دەرهێنـا و بەهـەمان ئۆتۆمۆبیـلْ گەڕامـەوە کـەرکوك ولـە نـاو شـار بـەجێم هێشت.

من بە گوێرەی دڵی خۆم تۆڵەی دەیان خوێنی بەناهەق ڕێـژراوم وەرگرتوەتەوە گێڕانەوەی یەکەیەکەی تۆڵەکانیش بەزوویی تەواو نابێت ، وا بزانم شەومان درەنگ کرد و سەریشم یەشاندی دکتۆر.

– بە پێچەوانەوە کاك نازم، بەلاّم لە کۆتایی پێم خۆشە بزانم.

+ ئایا تا ئێستا دەبێ هیچ بێ تاوانێك نەبووبێتە قوربانی و بە هەڵە نەتکوشتبێ؟

– باوەڕ دەکەی گەر بڵێم بە گۆڕی شەهیدان سوێند ئەخۆم جگە لە جــەللاد و ســیخوڕان لــە ئەفــسەری ســێ ئەســتێرە بــەرەو خــوارم نەکوشتووە، ئەویش بە مەرجێ تاوانەکانی ڕوون و ئاشکرا بوو بێت.

. دوو کۆتەرەم خستە ناو سۆبا دارییەکەوە و چراکەم تۆزێ کز کرد و نوقمی قووڵایی خەو بووین.

سبەینێ نازم ماڵ ئاوایی کرد و ڕۆیشت ئیتر نازمم نەدیەوە تا چەند ڕۆژێ لـەوەدوا هـەواڵی شـەهید بـوونی نـازم گەیـشتە بارەگـای شۆڕشـگێڕەکان، ئـەو لـە کـاتی نیـشان شـکاندندا فیـشەکێکی ویـڵ گەڕابووەوە شەهیدی کردبوو.

ئیتر ئەو تەلیسمەی سنووری دەبەزاند و دەچووە شارەکان و ناو جەرگەی حکومەتەوە و دەبوو بە شەوە و مۆتەکە، دەستی دەنایە سەردەمی جەللادەکان و دەیخنکاندن کۆتایی هات. شەهید بوونی نازم هەرچەند کەسەرێکی پڕ داخ بوو لە دڵی شۆڕشگێڕەکاندا بەڵام لە پشت هیچ دەستێکەوە نەبوو، هەروەکو کۆچێکی ئاسایی کۆتایی پێ هات و کردارەکانی بوون بە وانەیەکی خۆ بەدەستەوە نەدان بۆ شۆڕشگێڕ و هاوخەباتەکانی.

## -١٤ -

لەوە بەدواوە شالاوی بە عارەب کردن و دەرکردنی کوردەکانی ناوچە کورد نشینەکان زیاتر پەرەی سەند کە لە بەیان نامەی ساڵی حەفتایا دانی پیا نەنرا بوو ناوچەی کوردستان بن، کەرکوك و خانەقین و مەندەلی و مەخموور و شێخانی دەگرتەوە، ئەو بەیاننامەیە لە نێوان حکومەتی عێراق و مەلا مستەفادا مۆرکرا بوو. براکانی منیش هەریەکە و بە جۆرێ پەرتەوازە بوون و کەرکوکیان بەجێ هێشت. دایە و باوە نائومێد لەو هەمووکوڕ و کچە کەوتنە ساڵەوە، بەدەردی پیریەوە دەیان نالاند.

کەچی حکومەت نەیهێشت دوا ساتەکانی ژیان لە کەرکوك بەدیار باوە گورگەوڕەوە سەربنێنەوە، هەردوکیانی وەك جووتێ پەرەسێلکەی نەخۆش لەگەڵ شڕە و شیتاڵی ماڵەکەیا خستە ئۆتۆمۆبیلێکی بارهەڵگرەوە، لە دەشتی نێوان هەولێر و موصل لە کۆمەڵگای زۆرەملێی جدیدە فرێی دان، لە ژێر چادرە شڕێك لەبەردەم قرچەی هاوین و تەپ و تۆز و ووشکەلانی.

دایە نەمرد و قسەکانی هاتە دی کە دەیوت :

- بەخوا وەکو ڕۆژی ڕووناك لێم ڕوونە ئەگەر نەشمان کوژن دەرمان دەکەن و ئەم شارەمان پێ بەجێ ئەهێڵن.

هـەموو شتێك لـە باریکیا دەپسیٚ، بـەڵام ستەم لـە ئەستوریا دەپسیٚ. ستەم و هـەڵس و کـەوتی نامرۆڤانـەی حکومـەتی بـەعس لـە تەنگەی ئەستووریا پسا.

ئەوان لە کۆتایی شانۆگەری یەکەیانا سەریان لە خۆیان شێواند و دەست و پێی خۆیان ون کرد.

گەلی کورد لێیان ڕاپەڕین و هەر یەکێك لە ڕۆڵـەکانی ئەم گەلـە لێیـان بـو بـە نازمێـك و کەوتنـە داپڵۆسینی جـەللادەکانی حکومـەت. ئەوەی کە خەون بوو لە هزر و دەروونی میللەتا هاتە دی و بەعسی قڕان دەستی پـیٚ کـرد. شڕەو شیتاڵی ئۆفیسە دەجاڵـەکانی ڕژێم هەڵدرایـە سەر شەقامەکان و تێکڕای دەزگا سەربازی و ئاسایش و سوپای میللی و قەسابخانەکان تار و مار کران. گەورە و بچوکی ئەم گەلە هەناسەیەکی تاساوی ساڵەهای ساڵیان هەڵمژی و بووژانەوە. لە زینداننی شارەکانا پاشماوەی بـیٚ سەروشوێنانی نێـر و مـیٚ ی کوردستان بە دەرکـەوتن، جامانـە و کەشیدەی خوێنـاوی و ئـاوەڵ کـراس و دامێن و سـوخمەی ئافرەتان لە پەناو پەسێری زیندانەکانا دەبینرا کە مۆرکی دەس درێژی کردنە سەر ئابڕویان پێوە دیاربوو.

دەزگای مل قرتاندن و ژێر زەوی تاریك و ڕیزێك ئەلقە گوریسی پەتی سێدارە دەبینرا، گوریسە چەورەکان بە ئارەقی ملی خنکاوەکان چڵکن ببوون. مەمکەمژە و شووشەشیر و پەڕۆ و پیتاڵی کۆرپـەی کورد دەبینـرا لـە ژووره بەنـدی یـە تەنیاییـەکانا، دیـواری بـە نووسـراو هەڵکەنـدراوی پاشمـاوەی ڕۆڵـە بـیٚ سەروشـوێنەکان دەبینـرا دەیـان و دەیان پاشماوەی ناحەز و ناشیرین و جێدەستی نا مرۆڤانە بەجێما.

گەلی کورد کۆڵیان بە حکومەت دا و حەوت بەردیان بەدوای مێژووە چڵکنەکەیدا فڕێ دا و بەنەفرەتیان کرد. کەچی هێشتا مێژووی پڕلە ژانی حکومەت دڵی ناسك و نەرمی گەورە و بچوکی گەلی کوردیان ڕەق نەکرد. ئافرەتان شەرواڵی کوردی یان دەدایە سەربازە لە ڕاپەڕین بەجێماوەکانی حکومەت تا گیانیان پارێزراو بێت. هاوکاری و دڵنەوایی خێزان و منداڵی جەللادەکانیان دەکرد و ڕەوانەیان دەکردنەوە بەرەو زێدی باو باپیرانیان لە خوارووی عێراق. شۆڕشگێڕانی بەرەی کوردستانی کەپێك هاتبوون لە هەموو پارت و لایەنە سیاسیەکان، بالا دەستی خاکەکەیان بوون و هەڵبژاردنێکی دیموکراتیانەی نموونەییان ئەنجامدا و پەرلەمان دامەزرا و بوو بە بنیادنەری حکومەتی هەرێمی کوردستان.

حەشاماتی جەماوەر لەبەردەم پێشەوای شۆڕشگێڕەکاندا ئاپۆڕەیان کردبوو. منیش برازاکەم کردبوە قەلا دۆشکان و دەستم لێ بەردابوو کەوتبوومە چەپڵە لێدان.